# من موسڵمانم ئایە توندڕەوم؟

## دیبەیتی

من موسڵمانم ئایە توندڕەوم دیبەیتێکی کراوەیە، بۆ گفتوگۆ کردن لەبارەی ئەوەی، ئایە ئیسلام توندڕەوی بەرهەم دەهێنێ، یان سیکولارو عەلمانیەت.



لە نێوان


د.إدریس کاریتانی

م.هاوژین مەلا ئەمین




# من موسڵمانم ئایە توندڕەوم؟

## نووسینی:د.إدریس كاریتانی، م.هاوژین مەلا ئەمین



چاپی یەکەم١٤٣٩ك –٢٠١٨ز



**نوسینگەی تەفسیر**

بـۆچـاپ و بڵاوکـردنـەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

من موسڵمانم ئایە توندڕەوم؟، د.إدریس كاریتانی، م.هاوژین مەلا ئەمین(نووسەر).

١١٦ لاپەڕە،

١٤* ٢١ سم

بابەت، فیکری

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

.هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٦٧٨) ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین، عمر عثمان عمر

# من موسڵمانم ئایە توندڕەوم؟

**دیبەیتی**

من موسڵمانم ئایە توندڕەوم دیبەیتێکی کراوەیە بۆ گفتوگۆ کردن لەبارەی ئەوەی ئایە ئیسلام توندڕەوی بەرهەم دەهێنێ یان سیکولارو عەلمانیەت.


**نووسینی**

**د.إدریس کاریتانی - م.هاوژین مەلا ئەمین**

# پێشەکی :

ئاشـــتی و تونـــدڕەوی دوو چـــەمك و زاراوەن جیهـــانی ئیسلامیان پڕکردووە لە ململانێ و گفتوگـۆ و دیبـەیت, ئـەم دوو چـەمکە لـەنێوان دوو ئایـدۆلۆژیای جیـاوازی ئیسـلام و عەلمانیەتدا ململانێیەکی قوڵی دروستکردووە، ئایـا کـام لـەم فکرەو ئایدیایانە خاوەنی ئاشتین یان سەرچاوەی تونـد ڕەویـن، زۆر بەداخەوە ئایدیای ئیسلامی لەگەڵ ئەوەی خـاوەنی یاسـاو ڕێساو واقیع و مێژوێکی سیاسـی و فکـری دوور و درێـژە لـە ئاشتی و پێکەوە ژیان و یەکتر قبوڵ کـردن، کەچـی تۆمـەتبار دەکرێ بەتوندڕەوی، بەپێچـەوانەوە عەلمانیـەت یـان سـیکۆلار واقیعێکی سـەد سـاڵەی بەرچـاوانی ئـەم سـەردەمەی هەیـە لـەجیهانی ئـەوروپی و ئیسـلامی لەتونـدڕەوی، کەچـی بۆتـە خـاوەنی ئاشـتی و ئـارامی بەشـیعارو دروشمـی بـێ بنـەمای بریقەدار، بـەهۆی ئـەوەی ئیسـلام لـە سیسـتەمی سیاسـی و دەسەڵات و حوکم دا نەماوە، ئەوی ماویـەتی تـەنها نوسـین و

قەڵەمە. تەواوی ئامرازەکان لـە هێـز و مـادەوە، تـا دەگاتـە ڕاگەیانـدن بەدەسـتی ئەوانەوەیـە، بۆیـە لـەزهنی زۆری میللەتانیان وا چاندووە، کە ئیسـلام سەرچـاوەی توندڕەوییـە، بەتایبـەتی کاریـان لـە عـەقڵ و بـیری تـازە پێگەشـتووی گەنجەکانمان کردووە. قسەکەرو کادیرو نوسەرەکانی عەلمانیـەت بۆماوەی سەد ساڵە شەو و ڕۆژیان بەیەکەوە نـاوە تـا لـەڕووی فکریەوە وێنەی ئیسلام و موسوڵمانان وابکێشن کە تونـدڕەو و ئاژاوەگێڕن، بەم کارەیان پەردەپۆشی تاوانـەکانی سـەد سـاڵی خۆیان بکەن لەجیهانی ئیسـلامی، لەبەرامبەریشـدا نووسـەرو بیرمەندانی ئیسلامی (دیارە مەبەستمان بەشێکیانە) بەردەوام خەریکی بەرگری کردنن لە ئیسـلام، تـا بـۆ بەرامبەرەکـەیان بسەلمێنن کە ئیسلام و موسـوڵمانان تونـدڕەو نـین، وا گومـان دەبردرێ ئیسلام دینی توندڕەوییە بۆیە بەردەوام دەبێ بـەرگری لێ بکرێ! لەکاتێکدا مێژووی سـێزدە سـەدەی ئیسـلامی لـە فکرو دەسەڵات و پێکەوە ژیان و ئاشتی پێویستی بە بـەرگری نییە، ئەوان خاوەنی داگیرکاری فکرین لـە جیهـانی ئیسـلامی خاوەنی داگیر کاری خاك و وڵاتن ئەوان داگیرکاری سـەروەت و سامانن، ئەوان خاوەنی کیمیابـارانی هێرۆشـیماو ناکـازاکی و

هەڵەبجەن!، خاوەنی کوشتن و بڕینی کۆمەڵکوژین!، خاوەنی دەسەڵاتی چەند ساڵەی سیستەمی عەلمانی نازی و فاشی و ستالین و لینین، با ئەوان بەرگری لەخۆیان بکەن. لە سێزدە سەدەی ڕابردوو موسوڵمانان خاوەنی پاراستنی ئاشتی و ئارامی بوون، خاوەنی پاراستنی گیان و ماڵ و سامانی خەڵك بوون، خاوەنی پاراستنی پەرستگاو فکرو ئایدیاکان بوون. بێگومان هەرێمی کوردستان بەشێك بووە لە جیهانی ئیسلامی، چەندان نمونەی جوانی ئاشتی و پێکەوە ژیانی ئایدیا جیاوازەکانی تێدایە، تا ئێستاش بەرهەمی ئەم ئیسلامە شوێنەواری ماوە، ئێمە وەك موسوڵمانێکی کورد شانازی پێوە دەکەین، بۆ ئەم مەبەستە چەند گەنجێکی ژیرو دانا و هۆشیار هاتنە لام داوایان کرد بەژداری دیبەیتێك بکەم لە ژێر ناونیشانی: (من موسوڵمانم ئایا توندڕەوم؟) ، لە(٢٢-٧- ٢٠١٨) لەگەڵ بەڕێز م. هاوژین مەلا ئەمین لە هۆڵی سەعد عەبدوڵا لە شاری هەلێر بەندەش لەبەر گرنگی بابەتەکە دەست بەجی قەبوڵم کرد، پێم گوتن من کەس لە لایەنگرو باکگراوندی فکری خۆم بانگ ناکەم، با زۆرترین خاوەن فکری عەلمانی بەژداری ئەم دیبەیتە بکەن. دیارە نوێنەری

قەنســـوڵخانەی هۆڵەنـــدی و نوێنـــەری وەزارەتـــی ئـــەوقافی حکومەتی هەرێم و چەندان کەسایەتی دیاری فکری و زیاتر لە سێ سەد گەنج ئامادەبوون لەگەڵ ڕاگەیاندنـەکان، دیبەیتەکـە لە بە کەشێکی ئارام بەڕێوەچـوو سـوپاس بـۆ خـودا. دواتـر لەسەر داوای بەشێکی زۆر لەگەنجان و خەڵکی نوخبـە داوایـان کرد دیبەیتەکە بخەینـە سـەر کاغـەز و بکرێتـە کتێبێـك تـا سوودی زیاتری هەبێ ئەوانەی نـەیانتوانیوە ئامـادەبن لـەڕێی کتیب سودی لی وەرگرن، لەسەر داوای ئەوان ئەو هەنگاوەمان نا، لێرەوە سوپاسی گـەنجانی کـەمپینی (هەڵمەچـوو) وە ئـەو براو خوشکانە دەکەم کە هاوکاریان کـردین بـۆ ئامـادەکردن و تایپ کردنی ئەم دیبەیتە بەهیوای سوود بەخشـین بەهـەمووان بەتایبەتی توێژی گەنجان.

دکتۆر: إدریس کریم کاریتانی.

٢٦ – ٩- ٢٠١٨



## کارەکانی بەندە لەکاتی ئامادەکردنی ئەم دیبەیتە بۆ نوسین و خستنە سەر کاغەزو چاپ کردن.

بێ گومان نوسین لەگەڵ گفتوگۆ و قسەکردن جیاوازە لەڕوی دارشتنەوە، بویە هەر گفتو گویەك بخریتە سەر کاغەز پیویستی بەهەندێك دەستکاری هەیە، بەناچاری بەندەش بەهەندیك دەستکاری زور کەمەوە کە پیویست بوە دەستکاریم کردوە بەم شێوازەی خوارەوە:

١- هەڵەچنی کردنی وشەکان.

٢- دارشتنەوەی نوسینەکە ئەگەر پێویست بکات، چونکە ئەمە وتەیە گوتراوە لەگەڵ نوسراو جیاوازی هەیە بەڵام بەبێ گۆرینی ماناو مەبەستی.

٣- تخريج کردنی فەرموودەکان.

٤- گۆڕینی هەندێك وشەی عەرەبی بو کوردی.

٥- مانا کردنی ئایەت و فەرموودەکان.

٦- شی کردنەوەی وشەی لاتینی .

٧- تەرتیب کردنی سەرە بابەتەکان بۆ وتەی هەردولا بەپێی پێویست.

٨- دانانی هامش بۆ ئەو وشانەی دیار نیین یان بیانین.

٩- دانانی سەرە بابەت.

١٠- رەش کردن و دیاری کردنی هەندێك وشەی دیارو مەبەست دار.



# سەرەتای دەست پێ کردنی دیبەیتەکە

## وتەی پێشکەشکار:

بــــەڕێزان مــــن کامــــەران خــــدر لــــە کــــەمپینی (هەڵمەچوو)[1]. لەگەڵتانم زۆر خۆم بە خۆشحاڵ دەزانم کە لــەم دەرفەتــە تــوانیم ئــەم دیبەیتــە لــە ژێــر ناونیشــانی ( مــن موسڵمانی ئایا توندڕەوم)؟ ڕێکبخەین لە نێوان دوو ئاراســتەی جیاواز، یــاخود بــە واتایــەکی تــر دوو کارەکتــەری کــە دوو ئاراستەی فکری جیاوازیان هەیە. بەڕێزان فکر و ئامانجی ئێمە لە دانانی ئەم دیبەیتە لە دوو خاڵ کورت دەکەمەوە:

---

(١) کەمپینی هەڵمەچوو کۆمەڵێك گەنجی جالاك لەریکخراوی ســپارکی هوڵەنــدی پێی هەڵسابون.

## یەکەم خاڵ:

ئەم فۆڕمە یاخۆد ئەم شێوازە لە ئەنجامدانی دیبەیت لـە زۆربەی وڵاتانی پێشکەوتووی دونیا شتێکی باوە کـە لـەنێوان دوو ئاراستەی فکری جیاواز، یاخود لـە نێـوان دوو کارەکتـەر کە ئاراستەی فکری جیاوازیان هەیە، لە جێگـای ئـەوەی ئـەو دوو کارەکتەرە لە سەر ئامانجی دیاری کراویان پەنا ببەنە بـەر ئاکتی توند، یاخود بە واتایەکی تر پەنا ببەنـە بـەر پـەڕگیری بەرامبەر یەکتر، ئێمە لێرەدا بە شێوازی هەڵمەچوو ئاڵوگۆڕی تێزەکانیان دەکەین ئاڵوگۆڕی ئەو ئەرگومێنتانـە دەکـەین کـە ئەو بەڕێزانە لێرەدا قسەی لەسەر دەکەن. خاڵێکی تر ئامانجـە سەرەکیەکەی ئێمەیە، ئەویش بریتیە لە گەیشتن بە مەودایەك، یاخود بە واتایەکی تر دەمانەوێت بگەین بە خاڵێـك کـە تێـدا ئەم دوو بەڕێزە چ دکتـور ادریـس کاریتـانی وەك سـپیکەرێك لەسەر ئاراستەی فکری ئیسلامی و مامۆسـتا هـاوژین مـەلا ئـەمین وەك سـپیکەر لەسـەر ئاراسـتەی فکـری سـکۆلاریزم، هەریەك لەم بەڕێزانە قسە لەسەر توندڕەوی دەکـەن ، ئامانجـە سەرەکیەکەی ئێمە ئەوەیە بگەینە خاڵێکی گشـتگر ، یـاخود ئەم دوو بەڕێزە رۆکەیەك و تێگەیشتنێکی گشتگیرمان بـدەنێ

لەسەر توندڕەوی ، ئایـا مەسـەلەی تونـدڕەوی مەسـەلەیەکی ئینسـانیە یـاخود مەسـەلەیەکە لـە چوارچـێوەی قوتابخانـە فکریەکان، ئیسلامیش وەك دین یـان وەك ئـەفکار لـە دایـك دەبێت.

بەر لەوەی بچینە سەر ئەجێندای بابـەتی دیبەیتەکـە یـەك خـاڵ مـاوە وەك داواکـاری لـە دانیشـتوانی بـەڕێز دەکـەم و داواکاری لەم دوو بەڕێزە کە وەك قسەکەر (ستەیگن) ئـەویش بریتیە لەوەی کە ئێمـە وا بکـەین ئـەم دیبەیتـە دیبـەیتێکی جیاواز بێت، بە واتایەکی تر دیبەیتێك بێـت لەسـەر بنـەمای لێك تێگەیشتن و بنەمای یەکتر قەبوڵ کردن ، یان بە واتایەکی تر دیبەیتێکی ئاقڵانە بێـت لـە نێـوان دوو ئاراسـتەی فکـری جیاواز، نەك دیبەیتێك بێت دیبەیتی چـەپڵە یـاخود دیبـەیتی فیکە، کە ئاراستەی دیبەیتەکە بڕوات ، منـیش دڵنیـام هـەم ئاستی هۆشیاری هەم ئاستی ڕۆشەنبیری ئەم دوو بـەڕێزە لێـرە دانیشتوون هێندە بـەرزە دانابەزنـە ئاسـتێکی ئـەم شـێوەیە، ئاستی ئێـوەی ئامـادەبووش ئەوەنـدە بـەرزە کـە دیبەیتەکـە چوارچیوەی خۆی بەرنادا.

## ئەجێندای دیبەیت:

ئێستا ئەجێندای دیبەیتەکە دەخەمەڕوو، من تازە لە دەرەوە قسەم لەگەڵ ئەو دوو بەڕێزە کرد لەسەر ئەوەی کە کامیان سەرەتا پێشەکی دەست پێبکات، دیارە بەڕێزان گیانێکی تەقەبولی زۆر جوانیان لە نێوان هەبوو لە ئەنجامدا گەیشتینە ئەوەی دکتور ادریس کاریتانی گوتی من حەز دەکەم مامۆستا هاوژین سەرەتا دەست پێبکات، م هاوژین گووتی سەرەتا با دکتور دەست پێبکات، خۆی ئەم گیانی یەکتر قەبوڵکردنە پەیامێکە نایەوێت زیاتر قسەی لەسەر بکەین. لە بەڕێز مامۆستا هاوژین دەست پێدەکەین و (٢٠) خولەك ئەو تێزەی خۆی ئامادەی کردووە پێشکەش دەکات. دواتر دکتور ادریس قسە دەکات و ئەویش (٢٠) خولەك ئەو تیزەی ئامادەی کردووە پێشکەشی دەکات، دواتر هەردوکیان (٢٠) خولەکی تر قسە دەکەن بۆ گفتوگۆکردنی ئەو تێزەی خستویانەتە ڕوو.

ئێمە بۆ هەریەك لەم بەڕێزانە وەك کەمپینی هەڵمەچوو بە شێوازی هەڵمەچوو دوو پرسیارمان ئامادە کردووە، بەر لەوەی

بچینە لای مامۆستا هاوژین دەمەوێت ئەو دوو پرسیارەی ئاراستە بکەم کە لە چوارچێوەی بابەتەکەی خۆی وەڵامی ئەو دوو پرسیارەمان دەست بکەوێت.

**پرسیاری یەکەم:**

**ئایا پێت وایا ئیسلام وەك دین دروستکەری بیری توندڕەوییە!؟**

یاخود توندڕەوی بابەتێکی ئینسانیە مرۆڤ خۆی لەگەڵ لە دایك بوونی لەگەڵی لەدایك دەبێت ؟.

**پرسیاری دووەم:**

**ئەو هۆکارانەی کە وا دەکات گەنج پەنا دەباتە بەر ئاکتی توندڕەوی یاخود ئاکتی پەڕگری و هۆکارەکەی بۆ چی دەگەڕێنیەوە؟**

**مامۆستا هاوژین:**

سلاوتان لێبێـت بـەڕێزان سـوپاس بـۆ ئامـادە بوونتـان و سوپاس بۆ ئەو میوانانەی لێرەن و ئەو گەنجە جوان و بەڕێزانـە کە ئەم کەمپینەو و دواجار ئەم دیبەیتەیان ڕێکخستووە، سڵاو ڕێز و بەخێرهاتنی دکتور ادریس و ئێوە دەکەم کە لێرەن. مـن سەرەتا دەست خۆشی لەو گەنجانـە دەکـەم کـە ئـەم ئیشـەیان کـردووە و تـا ڕادەکـەی ڕاسـتی تێدایـە چـونکە ئـەم جـۆرە دیبەیتانـە کۆمـەڵگای ئێمـە و خـەڵکی ئێمـە کـەمتر پێـی ئاشنایە، هەندێ جار ڕوبـەڕووی گفتوگـۆی تـر و لێـك حـاڵی نەبوونی زۆرمان بەیەکەوە بینی بێت. بۆ ئەوەی زەمینەیـەکی باشـتر بڕەخسـێنرێت و لـە نزیکـەوە گفتوگـۆی بکـەین ئـەوە شتێکی جێگەی ڕێـزە . مـن دێمـە سـەر تێزەکـەی ئامـادەم کردووە: پێم خۆشـە گفتوگـۆی تێـر و تەسـەل بکـەین، هـەوڵ دەدەم لە میانەی قسەکانم وەڵامی دوو پرسیارەکەش بدەمەوە.

بێگومان هۆکارەکانی توندڕەوی زۆرن هۆکاری سایکۆلۆژی هەیە کە مرۆڤ خۆی تونـدڕەوە و انـتی سۆشـیەڵە و هۆکـاری سیاسی و کۆمەلایەتی زۆر هەن بـۆ توندوتیـژی، هۆکارەکـەی

پەیوەندی بــە ژیــانی سیاســی هەیــە و پەیوەنــدی بــە ژیــانی کۆمەڵایەتی هەیە و پەیوەندی بە قۆنــاغی گۆرانکاریەکانــەوە هەیە، کە پێیدا دەڕۆن بەڵام ڕاستەوخۆ ئەوەی بۆ مــن گــرنگ بێت و لــە بەرنامــەی گفتوگۆکەشماندایــە بریتیــە لــە فکــرەی علمانیەت یاخود سیکۆلاریزم، لەگەڵ ئیسلام یــان ئیســلامیزم ئەگەر دروستر بڵێم دواجار پەیوەندی بە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی بە مەسەلەی توندڕەوی .

وەك باسم کرد تــوندڕەوی هۆکــاری زۆرە ئەگــەر نمونەیــەکی فــەرمودەی پێغەمبــەر بێنمــەوە کــە دەڵێــت "((النــاس معادن))([1])، ئینســانەکان مەعــدەنی جیاجیــان هەیــە خــۆی تەنەکەیە، هەیە خۆی نەرم و نیانە، و هەیە خۆی توندوتیژە، و هەیە بۆخۆی سایکۆلۆژیەیەکی لەبار و گونجاوی هەیــە، بــەڵام هەشە خۆی سایکۆلۆژیەکی خراپ و ئەنتی سۆشــیەڵی هەیــە، بــارێکی نالــەباری کۆمەڵایــەتی هەیــە. بــەڵام لــە کۆتــایی

---

[1] ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردوە، ذمارة، (٢٦٣٨).

ئاراستەکانی ئێمە و تێڕوانینەکانی ئێمە سەبارەت بە چۆنیەتی ڕێکخستنی ژیان ئــەو ئایدۆلۆژیایــە ڕۆڵ دەبینێــت لــە بــارەی ئاراستەکردنی شێوازی ژیانی ئێمە و پاساوی پیرۆز و پاســاوی ئایدۆلۆژیا و پاساوی فکری بدۆزینەوە بۆ کاری توندوتیژی، کە لە ژیانی خۆمان مومارەسەی دەکەین یان قەنــەعاتمان ئەوەیــە مومارەسەی بکەین زۆر بە کورتی، چــونکە پــێم وایــە تــەنیا دەتوانی وەك تێز قسە لەسەر ئــەو بابەتــە دەکــەین و بــیروڕای خۆم بخەمەڕوو. من پێم وایە کە سکۆلاریزم بریتیە لە جیــدار یان بێلایەنی لە بیروبــاوەڕی خەڵکــەوە لــە ئاراســتە فکــری و ئادۆلۆژیە جیاوازەکانی ناو ژیانی کۆمەڵایەتیەوە، سیکۆلاریزم یەکێکە لە پایە سەرەکیەکان، ئەگەر بگەڕێنــەوە بــۆ مێــژووی سەرهەڵدانی و ئەو ململانێیەی بونەتە هۆی دروستبوونی ئــەم تێــزە لــەناو ڕۆژئاوایەکانــدا بەتایبــەت پەیوەنــدی زۆری بــە گفتوگۆی پیۆلۆجی و گفتوگــۆی لاهــوتی گرنگــی نــاو ئــاینی مەسیحی هەیە" بەتایبەت پەیوەندی بە بزوتنەوەی ڕیفــۆڕمی

ئاینیەوە هەیە، وە پەیوەندی بە بیرۆکەی (جۆن لوك)[1]. هەیە کە بیرۆکـەی تەسـامـوحە پێـداگیری لەسـەر دەکـات. ئـەوەی دەکرێت من جیاواز بم بیروباوەڕم تـەواو جیـاواز بێـت لەگـەڵ بیروباوەڕی تۆ و لەگەڵ هیچ لەو ئایدۆلۆژیا و تەسەوراتانە نەبم کە تۆ هەڵت گرتووە بـەڵام ئـەتوانم لەگـەڵت بـژیم لێکبـوردن نەوەك لێبوردن، بـەڵکو پێکـەوە هـەڵکردن. مـن لەگـەل تـۆ نـاگونجێم لـەڕوی ئایـدۆلۆژیا و بیروبـاوەڕی مـن و قەناعـەتی خۆمم، بەڵام دەتوانم لەگـەڵت بـژیم، ئـەوکاتی دەزانم کـە تـۆ هەڵەیت دان بە خۆم بگرم لەبەر ئەوەی مـرۆڤ بەرپرسـیارە لـە ژیانی خۆی، بەرپرسیارە لە چارەنوسی خۆی، و بەرپرسیارە لـە داهاتوی خۆی و ئەو دونیا و ئەو دونیای خۆی، لەبـەر ئـەوەی کائینێکی عـاقڵ و ئازاد و سەربەخۆیە.

بۆیە ئەم چەمکانەی بەکاری دێنم تەسەوڕ دەکەم هەموویان

---

(1) جون لوك : فەیلەسوف و بیرمەندیکی ئینگلیزیە لەسالی ١٦٣٢ لەدایك بوە و ١٧٠٤ کوچی دوایی کردوە.

پایەی گرنگ و پەیوەندی بە بیرۆکەی سکۆلارستی هەیە بۆ دونیا. بە بڕوای من و سکۆلاریستەکان: مرۆڤ دەبێت بۆ ئەم دونیایە بژی و لەم دونیایە ئەژی و مرۆڤەکان ئازادی یەکسان و کەسایەتی یەکسان و سەربەخۆی یەکسانیان هەیە، پێویستە لەو بابەتانەی پەیوەندی بە یەکسانیان هەیە بەرامبەر یاسایە، بەرامبەر هەل و مەرجی کۆمەڵایەتیە جیاوازەکان، و لە ڕووی ئایدۆلۆژیاوە و لە ڕووی عەقڵی و یەکاسانی بەهرەمەند بین و ژیانی ئەو دونیایە بۆ ئەو دونیایەیە، نەوەك لە پێناو دونیایەکی تر و ئێمە ئەو دونیایە نەکەینە شوێنی یەکلایی کردنەوەی کۆمەڵەك کێشە لە نێوان خۆمانەوە کە پەیوەندی بە داهاتومان، یاخود پەیوەندی بە دونیایەکی ترەوە هەبێت، هەروەك دەزانین کە مێژووی ئاینەکان بە تایبەت فکرەیەکی دورودرێژ لە ئاینی مەسیحی پڕیەتی لە شەڕو ململانێ ئاینی و پڕیەتی لە سەرکۆنەکردنی کۆمەڵێك خەڵك، بە هۆی ئەوەی تۆمەتبار دەکرێن بە بیدعەبازی، لە دەستوری ئایینی لایان داوە، ئەمە دواجار دەبێتە هۆی ئەوەی شەڕی ئاینی زۆری کۆمەڵگا ڕۆژئاوایەکان دروست دەبێت و ئەم تێزە دێن بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە بۆ ئەوەی ئەم ڕاستیە بە ئێمە بڵێت کە مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە کە هەڵە بێت و مافی هەیە،

کە بە هەڵە بیربکاتەوە مافی هەیـە بـە شـێوەیەکی هەڵـە لـە ژیانی تایبەتی خۆیەوە لـە دیـدی مـن ڕەنگـە منـیش هەڵـە بیربکەمەوە، یان هەڵە بژیم لە دیدی ئـەو، بـەڵام مـرۆڤ مـافی ئەوەی هەیە هەڵە بیربکاتەوە یان هەڵگری بیروبۆچـونێك بێـت کە لە دیدی منەوە هەڵە بێت، پێـداگری لـە پێنـاو ژیـان لـە ئێستادا لە پێناو ئێرەدا و یەکسانی هەڵ و مەرجی مرۆیی لـە ئێستادا یەکێك لە پایە گرینگەکانی سکۆلاریستە. پرۆسەیەك هەیـە هەنـدە جـار ڕەنگـە ئێمـە ئەگـەر پەیوەنـدیان بـە سـکۆلاریزمەوە زۆرە وەك (بحـث) بیروباوەڕێکـە لـە نـاو کتێبخانەکاندا باسی بکەین کە بریتیە لە سکۆلاریزەیشن یـان بە سکۆلاری کردنـی کۆمـەڵگا، یـان پرۆسـەی وردە وردە بـە علمانی کردنی کۆمەڵگا، هەندێ جار ئەو پرۆسـەیە پرۆسـەك نەبووە بە پاکی و بە چاکی و بە ئاسانی بڕوات بەڕێوە، هەندێ جار هەندێك ئایدۆلۆژیای توندڕەو و هێزی ئادۆلۆژیـای پـڕگیر لە ناو ڕەوتی سکۆلارستی دا لە پرۆسـەی سکۆلاریزەیشـن بـە علمانی کردنـی کۆمـەڵگادا، ڕەنگـە بـە باشـی پرۆسـەکەیان بەڕێوەنەبردبێت ببێتە هۆی پەرگێری یان تونـدڕەوی بەرامبـەر نەیارانی، ئایدۆلۆژیای خۆیان یاخود دۆخێك دروست بێـت کـە من بیروباوەڕێکی جیاوازم هەبێت، هەست بکەم پێداگیریـەکی

زیـاتر لێبکرێـت یـان زەغتێکـی زۆرم لێبکرێـت بـۆ ئـەوەی قەناعەت و بیروباوەڕەکانی خۆم بگۆڕم. بـەڵام بـە شـێوەیەکی گشتی لە ڕاستی دا سکۆلاریزم پایە سەرەکیەکەی بریتیـە لـە گرینگیدان بە ژیـانی دونیـا و یەکسـانی سـەیرکردنی هـەل و مەرجی ئازادی و هەل و مەرجی مرۆڤ لەم دونیایـەدا. بریتیـە لە ڕێگەدان بە هەموو بیروباوەڕەکان بۆ ئەوەی بەیەکەوە بژین، و بریتیە لە هەڵوێستی بـێ لایـەنی دەوڵەتـە لـەو ململانێـی ئایدۆلۆژیا و فکریانەی بە تایبەت ململانێی ئاینیەکان لە نێـو کۆمەڵگا، لێرەدا ئەو تێزە دێتە دەرەوە کە دەوڵـەتی سـکۆلار کە دەسەڵاتی سکۆلاری دەسەڵاتێکی بـێ ئاینـە" مەبەسـت لێی هەڵگری هیچ بیروباوەڕێکی ئـاینی دیـاریکراودا نیـە لـە واقعی کۆمەڵایەتی و سیاسی دا" ئەو پشتگیری هیچ لایەنێك ناکا دژی هـیچ لایـەنێك تـر نیـە. ئایدۆلۆژیایـەك دژی هـیچ ئادۆلۆژیەکی تر، یان مەزهەبێکی تـر، یـان فرقەیـەکی تـری دینی ناکا . هەر دەوڵەتێك بە تەسەوڕی مـن ئـەو لایەنـە بـە پۆزەتیفی لەدەستە و دەتوانێـت بـە گـوێرەی پڕەنسـیپەکانی سکۆلاریزم خۆی بیخەینە ژێر پرسیارەوە، و دەتوانین بڵێین کـە هەڵوێستێکە پەیوەندی بـە ڕێکخسـتنی ژیـانی کۆمـەڵگاوە هەیە.

## کاتێک دێینە سەر قسە کردن لەسەر ئاینی ئیسلام:

بــە دیــاری کــراوی وەك گــوتم مــن زیــاتر قســە لەســەر ئیسلامیزم ئایدۆلۆژیای ئیسلامی بکەم نەك زیاتر قسە لەسەر ئیسلام خۆی، تەبعەن قسەکردن لەسەر ئیسلام خۆی ئاستێکی پیۆلۆجی دیاری کراوی خۆی هەیە، کە ڕەنگە سودێکی زۆر لە پەیوەندی بە ئایدۆلۆژیای ئیسلامیەوە هــەبی کــە لــە واقعــی مێژووی و کۆمەڵایەتی ڕەنگ دەداتەوە ، دواجار دەبێتە هــۆی جوڵێنەری مرۆڤەکان، لەسەر ئاستی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی و گشتیش، ئەمە بۆمن گرنگە چونکە ئیســلام و ئیســلامیزم ئایدۆلۆژیای ئیسلامی یەکێکە لەو ئادۆلۆژیایانەی لــە واقعــی کۆمەڵایــەتی و واقعــی سیاســی و شارســتانی دیــاریکراو دەتوانێــت وەك هێزیکــی کۆمەڵایــەتی لــە پــەنای هێــزە کۆمەڵایەتیەکانــەوە مــافی ژیــانی هــەبێت، مــافی دەربــڕینی هەبێت، هەتا ئێرە هیچ کێشەیەك نیە.



**بەڵام کاتێك ئەم هێزە بە تەبیعەتی خۆی محاوەلەی ئــەوە دەکات دەسەڵات بگرێتە دەست و فەزای گشتی داگیر بکات،** محاوەلەی ئەوە دەکات ببێتە ڕەنگی سەرەکی تاکـە ڕەنـگ لـە بواری ئـاینی و کۆمـەڵایـەتی و سیاسـیدا، کێشـەکان لێـرەوە دروست دەبن بە بۆچونی من. ئەمــە هەنـدێکی ئـەم کێشـەیە ڕەهەنــدێکی لاهــوتی هەیــە، لەبــەر ئــەو ئەنپۆسۆکســیەت مەبەستی لێی ئەوەیە بیروباوەڕێکی ئاینی یان مەزهەبێك پێی وایە تاکە ڕێگە خۆیەتی، هەموو بیروباوەڕەکانی دیکە هەڵـەن ئەچنە چوارچێوەی لادانەوە، ڕێگەی ڕاستی ئیسلام لە ڕێگــەی ڕاستی مەسیحیەت لە ڕێگەی ڕاستی ئەو ئاینە دیـاری کـراوە کاتێــك ئــەم محاوەلەیــە ســەرهەڵدەدات لــە نێــو هــەر ئایدۆلۆژیایەکەوە ، بــە تایبــەت ئایدۆلۆژیایــە ئاینیــەکان بــە تەبیعەتی خۆیـان بـەرەو ئـەم ئاراسـتەیە بـڕۆن، لـەو کاتــەدا پەیوەندیەك لە نێوان توندوتیژی و توندڕەوی و پەڕگری لەگــەڵ بیرەباوەڕی ئاینیدا بە تایبەت بیروباوەڕی ئیسـلامیدا دروسـت دەبێت.



## مەسەلەیەکی تر ئەوەیە ئێمە یەک ئیسلامان نیە!

چەند ئیسلامێکی جیاوازمان هەیە شانبەشانی یەکتری لە قۆناغی جیاوازی مێژوویی و ژیانی کۆمەڵایەتی جیاواز فەرمان ڕەواییان کردووە و ئاراستەی ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکیان گۆڕیوە. هەر ئێستا لە ناو ئەم هۆڵەدا بەرێزتان دانیشتوون ئەکرێ من وەك موسڵمان بە ئاراستەیەك بیر بکەمەوە و ئەوی دیکە بە ئاراستەیەکی تر بیر بکاتەوە و فکری ئیسلامی لە ناو شارستانیەتی ئیسلامی زۆر و زەبەنە، لێرەدا پرسیارەکە ئیشکالی تر دەبێتەوە. ئەگەر پێمان وابی ئیسلام توندڕەوە، یان ئیسلامی بوون واتا ئیرهابی بوون، یان موسوڵمان بوون واتا توندڕەونەبوون یاخود ئیسلامی بوون، واتا مرۆڤ نەتوانێت خۆی لە توندڕەوی بپارێزێت. هەموتان دەزانن لە واقعی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێمەدا دەیان هێز لە مێژوو هەبوون و دەیان هێز لە ئیستادا هەیە رەنگە دەیان هێز گومانی تێدا هەبێت زۆرە بەڵام هێزمان هەن بە ناوی بیروباوەڕی ئیسلامیەوە بە شێوەیەکی دیکە تەفسیری ئەوان

ڕاستترین تەفسیرە بۆ ئیسلام، خەریکی توندترین فۆڕمی توندوتیژین کە ئێمە وەك موسڵمان هەست بە شەرمەزاری دەکەین، و من خۆم شەرمەزارم بەرامبەر ئەو بیرکردنەوەیە، کە هەندێ جار بە شێوەیەك لە شێوەکان وەك دۆخی شارستانی، یان کۆمەڵاتی، یان هەر دۆخێکی تر بێت تۆش بەشیکی لەمە. پیم وایە بیری ئیسلامی ئەو واجبانە کە پێویستە ئەرکەکانی جێ بەجێ بکەین جێ بەجێ مان نەکردووە لە ماڵەوە تاوەکو بە ناوی ئیسلامەوە توندڕەوی دروست نەبیت. ئەو توندڕەویەی لە ئیسلامدا هەیە یاخود ئەو موسڵمان بونەی دواتر سەر دەکێشی بۆ توندڕەوی پەیوەندی بە فۆڕمێك و بیرکردنەوەکی ناو ئیسلامەوە هەیە بۆ ئاراستەی باڵا دەست، کۆمەڵێك بنەما هەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کەسێك بە ناوی ئاینەوە توندڕەوی بکات بەرامبەر ئەوانی تر، یاخود هەندێك هێزی پەڕگیر توندڕەوی جێ بەجی بکەن بەرامبەر ئەوانی تر کە دەستی ئەو ئایدۆلۆژیایە بۆ ئەوەی جێگای خۆیان بکەنەوە بۆ دەست درێژی کردنە سەر کۆمەڵگا لەو ڕێگەوە ئاراستە بکەن. پێم وایە هەر بیروباوەڕێك هەڵگری ئاسۆدۆکس بێت دواجار بەرەو توندوتیژی

هەڵدەکشێت، واتە ئەو بیرۆکە ئایدۆلۆژیا ئاینیە باوەڕی وابێت تەنیا خۆی ڕاستە ئەوانی تر خەڵکی سەرلێشیواون وپلە بە پلە چونەتە دەرەوە و ڕێگای ڕاست تـەنیا یـەك ڕێگایـە، ئیسـلام تـەنیا یـەك ئیسـلامە تـەنیا یـەك تەفسـیری هەیـە، یـەك تەرجەمەی هەیە، تەنیا یەك مەنەفێستی هەیە. ئەو کەسانەی ئاوا بیردەکەنەوە لە ناو هەر ئاینێك بە تایبەت باس لە ئـاینی ئیسـلام دەکـەین پـێم خۆشـە فۆکـەس لـەوە بکـەم ئـەم ئەنسۆدۆکسە دواجار درێژە دەکێشێت بۆ توندوتیـژی لـە بـەر ئەوەی کە تۆ پێت وابوو تەفسیرت تۆ لە قورئـان و حـەدیس و خوا تاکە تێگەیشتنی دروسـتە، بێگومـان بەشـێوەکی دیکـە لەسەر ئاستی جیا جیا سەرەتا توندوتیـژی دەروون مومارەسـە دەکرێت، دواتر توندوتیژی لەفزی و دواجار درێژە دەکێشێت بۆ توندوتیـژی ئاسـتەکانی تـری توندوتیـژی، یـەکێکی تـر لـە کێشەکان کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئاراستەی ئیسـلام پشـتگیری توندوتیژی بکات پەیوەندی بە عەقیدەی سەلەفی هەیـە. بـەڵام پەیوەندی بە بیرکردنـەوەی سـەلەفیانە هەیـە لـەناو ئیسـلام، بیرکردنەوەی سەلەفیانە من مەبەستم ئەوەیە پێـداگری لەسـەر حاکمیەتیی پێغەمبەر دەکات وەك حاکمیەتی خودا و پێداگری

لەبیردۆزی دەقی سوننەت دەکات، وەك دەقی قورئان پێـداگری لەسـەر میراتـی فقـە، میراتـی تشـریعی وەکـو بەشـێوەیەکی دانەبراو لە ناو ئیسـلام هەیـە، وە بەشـێوەیەك لـە شـێوەکان پێداگری لە بەشێك لە ململانێ دەکات لە مێـژووی ئیسـلام و ژیانی موسڵماناندا پێدا تێپەڕیوە و کەسانێك هەن تـا ئێسـتا بەهەمان دڵ گەرمی و حەماسەتەوە کە (١٤٠٠) و ئەوەنـدە ساڵە حەزرەتی عەلی و معاویە شەڕیان کـردووە ئێسـتاش لـە بەینی شیعە و سوونندا خەریکی شەڕکردنن و لەگـەڵ گروپـی تردا بەناوی رافیزەو ناوی تری جیا جیـا و نـاو نـاتۆرەی جیـا خەریکی شەرکردنن، وە ئەو ئاراستە ئیسـلامیەی پێـی وایـە مەساحەی پیرۆزی ئیسلام گەورەترە تەنیا لە دەقـی قورئـان و وە هەروەها لێکدانەوەیەك بۆ دەقی پـیرۆز خـۆی کـردووە بـە خاوەنی میراتگری ئەو شەڕو ململانێیە لە دونیـای ئیسـلامی هەبوون ئەم بیرۆکەیە بەرەو توندوتیژی درێژە دەکێشێت.

## ووتەی پێشکەشکار:

بەڕێزان ئێستاش دەچینە لای د.ادریـس بابەتەکـەی خـۆی پێشـکەش دەکـات لەسـەر چوارچـێوەی ئـەم دیبەتـەی ئێمـە

دامانناوە دەمەوێت لە چوارچێوەی بابەتەکە د. ادریس وەڵامی ئەو دوو پرسیارەم دەست بکەوێت:

**یەکەم: ئایا سکۆلاریزم یاخود علمانیەت و ئەو قوتابخانە فکریانەی کار لەسەر ئەوە دەکەن بەجۆریك لە جۆرەکان فەسڵی دین لە ژیان یاخود کۆمەڵگا لە دین دابڕن ئەمە بە واتای ڕەتکردنەوەی یاخود بەواتای پەراوێزخستنی دینە؟. وە تا چەند فاکتەرە بە دەستی کەسی مولتەزیم بە دینەوە تاوەکو پەنا بباتە بەر توندڕەوی یاخود گروپە توندڕەویەکان؟**

**دووەم: ئایا توندڕەوی خۆی وەك سروشت بەشێکە لە ئیسلام خۆی؟**

**یاخود توندڕەوی بابەتێکی ئینسانیە پەیوەندی بە مرۆڤ و لەدایك بوونی هەیە، یاخود مێژووەکەی دەگەڕیتەوە بۆ (١٤٠٠) سال لەمەوبەر مەبەستم مێژووی ئیسلامیە؟.**

# وتاری بەڕێز دکتۆر: ادریس کاریتانی

**بەشی یەکەمی  وتاری بەڕێز دکتۆر: ادریس کاریتانی**

**وەڵامی دکتور إدريس:**

**بەناوی خودای گەورەو میهرەبان صەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم).**

زۆر سوپاسی ئەم کەمپینە دەکەم بەڕاستی پێم وایە هەنگاوێکە لەو هەنگاوانەی زۆر گرینگە، دەبوو حکومەت پێش دوو ساڵ لە دوای ساڵی (٢٠١٣) بەسەرەوە دەیان و سەدان کەمپینی ئاوای ڕابگەیاندایە، دەیان دیبەیتی وای بکردایە بۆ ئەوەی خەڵکی ئاڕاستەیەکی تەندروست وەرگرێ،

**هەروەها دەزگاکانی ڕاگەیاندن:**

بەڕاستی لەهەمموو وولاتان دەزگای ڕاگەیاندن بۆخۆی دەسەلاتی چوارەمە بەلام تەئسیرات و کاریگەری وەك دەسەلاتی یەکەم هەیە، بەڕاستی ئەوانیش وا هەست دەکەم کەم تەرخەم بوون لەم بوارە بۆیە جێگای ڕێزە ئەم گەنجانە لەم تەمەنەوە هەست بەشتێکی ئاوابکەن، سوپاسی مامۆستای زۆر بەڕێز ﴿م.هاوژین﴾ دەکەم کە لەوێوە تەشریفی هێناوە بۆ ناو هەولێر لە خزمەتی بین" سوپاسی تەواوی ئامادەبووان دەکەم .

**ئەو بابەتەی کە ﴿م.هاوژین﴾ ئاماژەی پێکرد تەرکیزی زیاتری لەسەر ئەوەبوو:**

**١- سیستەمی سیکۆلار یان سیستەمی عەلمانی باشترە گونجاوترە بۆ ژیان".**

**٢- یان بەمانایەکیتر ئەگەر بلێین ئەگەر دین بتوانێ خۆی بسەپێنێ یا ئیدارەی دەوڵەت بکات یا سیاسەت بکا یا حوکم**

**بکا یان به مانایەکی تر تێکەڵی دین لەگەڵ تەواوی ژین ئەمە هۆکارێکی ئەساسیه یـان سـەرەکی یـە بـۆ دروسـت بـوونی توندڕەوی وە بۆ دروستبوونی عونف!!!.**

دیاره من نامەوێ موجامەله لەو بابەته بکـەم نـه لەگـەڵ کاك هاوژین نه لەگەڵ جەنابیشتان، دەمەوێ زۆر بەراشـکاوانه و بەڕاستی هەم وەڵامی کاك هاوژینی تێدا بێ، هـەم وەڵـامی هەردوو پرسیاری برای بەڕێزم کاك کامەرانی تێدابێ. ئایه بـه فعلی سیکۆلار بۆته ئەمنیەت!؟ بۆته ئاشتی بۆته سەلام!؟ یان پێچەوانەیەتی.

وە هەروەها ئایا ئیسلام به مانای کەلیمـه مەدرەسـەیەکه لەو مەدرەسانەی ئەگەر گەیشتن بەدەسەڵات یـان ئـەو سـێزدە سـەدە و نیـوەی کەدەسـەلاتی لەدەسـت بـووە سیسـتەمێکه سـەرکوتکەر بـووە!؟ عـونفی دروسـتکردوە توندوتیـژی دروستکردووە!؟. بەشیوەیەکی ئاسایی وەڵامی بابەتەکه بەدوو تەوەر دەدەمەوە.

**تەوەرەی یەکەم : چـەند یاسـایەکی قورئـانی دژی توندڕەوی،** زۆر بـەکورتی بەچـەند یاسـایەك لـەقورئان و وە لەسونەتی پێغەمبـەر ﴿صـلی اللە علیـە وسـلم﴾ دەسـت پـێ ژووی. دوایی دێمە سەر .

## بەشی دووەم: پێم خۆشە بە راشـکاوی و بەڕاسـتی ڕەئی خۆم دەربڕم بەهەندێك لەسەرچاوەکانی خۆیان:

بەڕاستی لەلای بەندە سەرچاوەی بـیری تونـدڕەی لەسـاڵی (١٧٨٩) سێ ساڵی بەسەر دا تێ دەپـەڕی واتـا (١٧٩٣) تـا (١٧٩٤) یـان (١٧٩٥) ئـەو سـەردەمە کاتێـك شۆڕشـی فەڕەنسـی سـەرهەڵدەدات، شۆڕشـی زانیـاری لەگـەڵ ئـەوەم شۆرشی زانسـتی بـوو، لەگـەڵ ئـەوەم شۆڕشـی تەکنـەلۆژیای سـەردەم بـوو، لەگـەڵ ئـەوەم شۆڕشـی تـەواوی بابەتـەکانی پێشکەوتن و داهێنان بو، لەڕووی بـواری پیشەسـازی، بـواری ئابوری لەڕووی تەواوی بوارە تەکنە لۆژیاکانی سەردەم ، بەڵام بەڕای بەندە شورشی فەڕەنسی توانی مروۋ بباتە نـاو مـانگ! بـەڵام نـەی تـوانی یـەك خێـزان دروسـت بکـات بـەئارامی!، هەرێمێك یان جەزیرەیـەکی ئـارام دروسـت بکـات، بێگومـان لەدوای شورشی فەڕەنسی یەوە بەپێ ی سەرچـاوەکانی خۆیـان

دەرگـای ئیرهـاب و دەرگـای عونـف و **سـەرەتای توند ڕەوی دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی فەڕەنسی،** ئێستاش بەداتاو ژمارە دەی سـەلمێنم، سـەرەتا پـێم خۆشـە ئـەو یاسـایانەی کـە قورئـان ڕاستەوخۆ دای ناوە بۆ ئەوەی هەم ببێتـە ژیـان، هـەم لەگـەڵ تـەواوی سیسـتەمی مرۆڤایـەتی و کۆمەڵایـەتی و سیاسـی و فەرهەنگی و و ئـابوری و سیسـتەمی دەوڵـەت داری تـەواوی سیستەمەکانی ژیان تێکەڵ ببێت. هەرکاتێك دیـنی لـە ژیـن جیاکردەوە وەکو ﴿غاندی﴾[1]، دەڵێت: (هەرکەسێك بـیر لـەوە بکاتەوە دیـن لـە ژیـن جیـا بکاتـەوە، یـان دیـن لەسـیایەت جیابکاتەوە، بەمانایەکی تر ئەوا ئـەو کەسـە نـە لەسیاسـەت گەیشتووە نەلەدین گەیشتووە).

لە ئێستادا ئەو ڕووسیایەی کە شۆڕشی کـرد تـا دیـن لـە ژیـن جیـا کاتـەوە. ئـەوروپای رۆژئـاوایی بـە تایبـەتی کـە سەرچـاوەکەی فەڕەنسـایە دوو دەوڵـەتی دینـی بۆخـۆی بینـا کـردووە، بۆخـۆی ڕەوایـە دەوڵـەتێکی بینـا کـردووە بـەناوی ﴿ئیسرائیل﴾، مەرکەزیەتی دینی هـەموو عالـەمی خۆیـەتی.

---

[1] ناوی موهانداس کرماشاند غاندی،سەروك و سیاسیەکی ولاتی هینـدە،١٨٦٩ – ١٩٤٨.

هــەروەها دەوڵــەتێکی تــری بینــا کــردووە بــەناوی دەوڵــەتی ﴿ڤاتیکان﴾، ئەویش سەرچاوەکەی هەر دینە. بــەڵام پێــی ڕەوا نابینێ لەعالەمی ئیســلامی دەوڵــەت هــەبێ. ئــەو دەوڵەتــە سەرچاوەکەی دین بێ، ئەمەش جۆرێکە لە دوو فاقی.

## یاساکانی قورئان بۆ نەهێشتنی توندڕەوی:

ئەو یاسایانەی قورئان بۆ ئێمەی دارِشــتووە مــەجال بــەوە نادات مرۆڤ بەهیچ شێوەیەك بیر لە توند ڕەوی بکاتەوە لەوانە:

## یەکەم: قەدەغــەکردنی گوشــتنی مــرۆڤ بەگشــتی:

سەرەتای دروســت بــوونی مرۆڤایــەتی کاتێــك قابیــل هابیــل دەکوژێ دەست بەجێ قورئان یاسایەك دادەڕێژێ دەفــەرمووێ: ﴿ مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۚ ﴾[1].

واتە: مرۆڤ دەبێ ڕێز لە مرۆڤ بگرێ: (جا لەبەر بێ فەڕی و

[1] المائدة: ٣٢ .

خراپی ئەو کوشتنە نادروست و نارەوایە، وە بۆ ئەوە جارێکی تر کاری وا ڕوونەداتەوە لەسەر نەوەکانی (یەعقووب)مان بڕیاردا کە هەرکەسێك بەناهەق مرۆڤێك بکوژێ یان بێ ئەوە کارێکی خراپ و گەندەڵی لەوڵاتدا کردبێ (وەك ڕێگرتن و شەریکدانان بۆ خوا، وەیان هەر هۆیەکی تر لەو بابەتانە کە دەبێتە هۆی کوشتنەوە) وەکو هەموو خەڵکی سەر زەویی کوشتبێ هەر کەسێکیش مرۆڤێکی بێ تاوان لەمەرگ رزگار بکا، وابزانێ کە تەواوی خەڵکی لەمەرگ ڕزگار کردووە و ژیانی پێبەخشیوە. بەڵێ ئەو دووبارەیە هەردووکیان قەدرو ڕێزنانە لەئادەمیی و پاراستنیەتی لەکوشتن).

کەواتە: هەرکەسێك لەسەرەتادا کەسێك بگوژێ ئەم یاسایە گشتیە دەی گرێتەوە، ئەمە یاسایێکە قەڕارێکە لەیەکێك لەماددە بەهێزەکانی قورئان.

## دووەم: وەڵاَم دانەوەی سێ پرسیارە فەلسەفیەکە: لەکوێ هاتوین؟ بۆچی هاتوین؟ دەچینەوە کێ؟.

بەڕاستی دەبێ ئێمە ئەوە لەبیر نەکەین سیکۆلار بەپێی

تەعریف و پێناسەی دائیرەی مەعاریفی بەریتانی کەبەخۆیان سەرچاوەکەیان بەو دەرکردووە، دەڵێ سیکۆلار : نموونەیەکی کۆمەڵایەتی یە هەوڵ دەدات ئاراستەی خەڵك لەدونیاداری کۆبکاتەوە دوور لەقیامەت داری ، واتا دوور لەدونیای دوارۆژ. کەواتە سێ پرسیارە فەلسەفیەکە لێرە هەرسێکیان دەکەونەوە گومان هەم لەکوێ هاتووین ئەم پرسیارە فەلسەفی یە ئەوروپا نەی توانی وەلامی داتەوە، وەکو نەزەریاتی داروین([1]) دەبێ کۆمەڵێك نەزەریات جیاواز و نازانستی بەدوای یەك دا بێنین بێ ئەنجام، ئەمە دیسان هەڵەیەکی گەورەی عەلمانیەتە، وە هەروەها بۆچی هاتووین و دەچینەوە کوێ. ئەم سێ پرسیارە فەلسەفی یە هەرسێکیان دەتوانین ئێمە تاکە دینین کە شانازی پێوە دەکەین، توانای ئەوەمان هەیە

---

[1] داروین کێیە: چارلس داروین کەسێکی مەسیحیە و لە ساڵی (١٨٠٩) لە ئینگلتەرا لەدایك بووە، پەرتوکێکی دانا بەناوی (اصل الانواع)، دواتر پەرتوکێکی تری نوسی (اصل الانسان)، باسی پەرەسندنی مرۆڤی تێدا بوو، لە ساڵی (١٨٨٢) کۆچی دوای کردووە

بەلۆژیك و مەنتیق و طب و زانست وەلاّمیان بدەینەوە، جگـە لەوەش ئەم پرسیارە کاتێك دەڵێین فەسلی دیـن لـە ژیـان وەك ئەوی ئەرستۆ گوتویەتی ، ویل دیورانـت[1]، دەڵـێ:﴿ئەرسـتۆ کاتێك وەسفی خودا دەکات بەوەی کە خودا دونیای دروستکرد وازی لێهێنا ئەم خودایە وەك مەلیکێکی ئینگلیز وایە﴾. واتە مەلیکە بەڵام دەسـەڵاتی بـەڕێوە بردنـی نیـە ، بـەڵام خـودا دەفەرموێ : ﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ [2].

واتە: (چاکیش بزانن! کە دروستکردن و تەگبیر و فـەرمانی بۆ بەڕێوەبردنی هەموو بوونەوەر، هەر بەدەستی ئـەوە زۆر بـە بەرەکەت و گەورەیە خوایەك کە پەروەردگاری گشت جیهانە).

شتێکی مـەعقول نیـە، شـتێکی فەلسـەفی نیـە، شـتێکی

---

(١) ناوی: ویلیام جیمس دیورانت" لە ١٨٨٥ ١٩٨١" فەیلەسوف و میـژونوس و نوسەریکی ئەمریکیە" لەدیارترین کتابەکانی قصة الحضارة بوو.

(٢) الأعراف: ٥٤.

زانستی نیە، شتێكی لۆژیكی نیە، تۆ شتێك دروست بكەی! هەموو پێك هاتەكانی ژیانی بۆ دابین كەی! هەموو جومگەكانی ژیانی بۆ فەراهەم كەی! بەڵام دواتر دەستم بەسەر ناچێ و بەڕێوەی نابەم! ئەمە وەكو ئەوە بڵێی وایە خودا دونیای دروست كردووە بەڵام دینەكەی بەكەڵك نایێ ، خودا مرۆڤی درووست كردووە، ئاسمانی درووست كردووە، هەرچی بیئەی دەوڵەت داری هەیە بۆ ژیان فەراهەمی كردوە: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦ﴾[1].

واتە: (ئەی نەتزانیوە كە بەڕاستی هەرچی لە زەویدایە كانگاو گڵ و هەواو توخمەكان و ئاوێتە كراوەكان، زیندەوەران، بێ گیانەكان، گژو گیا خوا بۆ ئێوەی دەستەمۆو ڕام كردووە؟ نە هەر ئەوەندە بەڵكو یاسای دەریاكانی وا دامەزراندووە كە: گەمیی و، كەشتیەكان هەر بەفەرمانی ئەو ،بەوهەموو بارو بارخانەوە بەنێویاندا دەڕۆن).

---

[1] الحج: ٦٥.

هـــــــەروەها: ﴿ أَلَمۡ تَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗۗ ﴾ [1].

واتە: (ئەی خەڵکینە! ئاخۆ نـەتان دیـوە کـە خـوا ئـەوەی لەئاسمانـەکان و زەویدایـە، هـەمووی بـۆ ئێـوە رامکـردووە ، وەنیعمەتەکانی بەئاشکراو بەنهێنی بۆ تـەواو کـردوون : چـاو، تەندروستیی، دڵ، ژیریی).

ئاسمان و زەوی بۆ دروست کردوین، بـەڵام لـەکۆتایی بلێـی دەسەڵاتی تەشریعی نیە! ئێمە([2]) سێ شتی ئەساسی یان چوار شتی ئەساسی مان هەیـە فـەرقمان هەیـە لەگـەڵ عەلمانیـەت لەگەڵ سیکۆلار.

## جیاوازی نیوان ئیسلام و سیکولار لەچوار خاڵدا:

### یەکەم: بڕوا بوون بەخودا:

(١) لقمان: ٢٠.

(٢) مەبەستمان ئیسلامە کە دەڵێن ئیمە.

یەکێ لەوانە کە فەرقمان هەیە ئەویش ئەوەیــە ئــەو چــوار شتەیە یەکێ لەوانە بڕوابوون بەخودا، حەقیقەتێکە تۆ نــاتوانی ئینکاری بکەی وەك ئــەوەی کــە کارەبــا دەدگــرێ هەستیشــی پێناکەی بەڵام ناتوانی ئینکــاری بکــەی ئــەوە واقیعــە دەبــێ ڕەچاوی بکەی([1]).

## دووەم: خواپەرستی.

خوا پەرستی بەشێکی سەرەکیە لە دینمان.

## سێیەم: تەشریع.

دینی ئیسلام بۆ هەموو بەشەکانی ژیان تەشریعی داناوە.

## چوارەم: ئەخلاق.

(١) سیکولار رای وایە هەر شتێك زانست و عەقل دەر کی پێ نەکات نابێ دانــی پێدا بنرێت بویە بەشیکیان بروایان بەخودا نیە، لەکاتێکدا سەدان شــتی پــەنهان و ون هەن مروڤ بەعەقل و زانست دەرکی پێ ناکات و دانیشی پیدا هینــاوە لەوانــە: کارەبا، عەقلی مروڤ، ....هتد.

لەهەموو کـارو کردەواکانمـان ئـەخلاق بنەمایـەو پیـوەرە، لەتەواوی بەشەکانی ژیانیش بەشدارە.

عەلمانیـەت لـەم دوو بەشـە دەسـتی بـەربووە و ئـەم دوو بنەمایەی نیە :

**یەکێکیان:** عیبادەتی نییە.

**دووەمیان:** بوارە ئەخلاقیەکە.

**مەبەستمان چیە لە بواری ئەخلاقی:** نەبونی ئەخلاق لەلای عەلمانیەکان کە دەڵێن مادام ئینسان ئازادە، ئـازادە لەهـەموو بوارەکان!، لەبواری جنسی[1] وە لە بـواری کۆمەڵایـەتی و لـە بواری سیاسـی، دروشمیـان ﴿الغایـة تـبرر الوسـیلة﴾[2]، واتـە: (هەر پاساوێك بەکار دەهێنی گرنگ ئەوەیە بگەیتە ئامانج).

(١) مەبەستمان لە بوارە جنسیەکە واتا عەلمانیەت زور جـار کەسـی مـەحرەمی خوی مارە دەکات یان کاری جنسی لەگەل دەکات، ئەمە لەلای ئیمە قەدەغەیە.
(٢) دروشمیکی میکیافیلیە.

لەسەر ئەم دروشمە ئێستاش دەبینین دونیا چۆن بۆتە یەك پارچە ئاگر لەسەر ئەساسی ﴿الغاية تبرر الوسيلة﴾. بۆ؟ چونكە عەلمانیەت ئەو بنەما ئەساسیەی تێدا نییە ، ئەو بنەما ئەساسیە لەگەڵ ژیان دەبێ ، لەگەڵ ژیانی سیاسی دەبێ لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی دەبێ ئینجا ئەوە قاعیدەی دووەم.

## یاسای سێیەم : ووشەی ئاشتی لەئیسلام و قورئان.

قاعیدەی سێیەم لەبیر نەكەین هەر لە قورئاندا بەس بابەتی سەلام (١٤٠) جار هاتووە، ئینجا دوای ئەوە كۆمەڵێك قاعیدەی بۆ داناوین قانونە، یەكێكیان :

### أ- ئاشتی كومەلآیەتی:

خودا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ ﴾[1]. واته:( ئەی

[1] الحجرات: ١٣.

خەڵکینە! بێگومان ئێوەمان لەپیاوو ژنێك دروستکردووە، واتە: لە ئادەم و حەوا، جا ئیتر ئەم هەموو سووکایەتیە چیە بەیەکتری ئەکەن؟ کردوومانن بەچەند گەل و تیرەیەك تا یەکتری بناسن، نەك بۆ گاڵتە کردن و تانەو تەشەردان لەیەکترو ستەم لەیەکتر کردن).

یەکتر ناسین بناغەی تێگەیشتنە، پێکەوە ژیانە هەموو ئینسانێکی قەبووڵە چۆن فەرموویی : ﴿مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ﴾ نەی فەرمووی نەفسی موسلمان یان غەیر موسلمان، تەنها نەفس، کەواتە دەیەوێ چی بکا.

## ب- ئاشتی گشتگیری و ڕەحم و بەزەیی:

دوایی قاعیدەیەکی ترمان بۆ دادەنێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً﴾[1].واتە:

[1] البقرة: ٢٠٨.

(ئەی گەلی خاوەن باوەران! دەبێ هـەمووتان ئامـادەی چـوونە ناو فەرمانی خوابن).

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ [1].

واتە: (ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد کە رەحمەت و بـەزەیی و میهرەبانییەك بیت بۆ هەموو جیهانیان).

ئەمە دروشمانە وەرن هـەمووتان بـەرەو ئاشـتی ، دیسـان ئەوە قاعیدەو یاسایە کە قورئان بۆی داناوین.

## ج- سەقافەی گفتگۆو حیوار.

خالێکی تر لە ئیسلام دا سەقافەی حیـوارو گفتـو گویـە، نەك دوبـەرەکی و ململانـێ، ژیـان دورو دریـژەو بـەململانی کوتایی نایە، بەڵام حیوارێکی هـادییء ئەسـاس و بنەماکـەی

[1] الأنبیاء: ١٠٧.

ئەوەیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا ﴾[1].

واتە: (ئەی پێغەمبەر! (صلی اللّٰه علیه وسلم) بەخاوەن نامەکان بڵێ: وەرن با ئێمەو ئێوە لەسەر وشەو بەرنامەیەك سووربین کە بۆ هەردوولامان چوونیەکەو یەکسانەو، پەیامبەرانیش هەموو هاودەنگ بوون لەسەری و، واز لەو تەفرەقەیە بێنن وەرن با جگە لەخوا کەسێکی تر نەپەرستین و، هیچ شتێکیش نەکەینە شەریك و هاوبەشی).

هەروەها: ﴿ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾[2].

---

[1] آل عمران: ٦٤.

[2] العنكبوت: ٤٦ .

واتە: (ئێوە لەگەڵ خاوەن نامەکاندا دەمەقاڵێ و مشــت و مڕ مەکەن، ، مەگەر بــەجوانترین شــێوەو شــێوازز، واتــە: زۆر بەنەرمیی و لەسەر خۆ بەڵگەو دەلیلیان بۆبێننەوە).

ئەمە سەقافەی جیــاوارە نــەك ململانــێ، ئــەوەی بنــەمای ململانێ دادەمەزرێنێ بە ڕاستی ئەمە هەڵەی کردووە.

### ت- سەقافەی جەنگ:

هەروەها سەقافەیەکی تر لەوانە سەقافەی چەنگ و قیتاله واتــە جیهــاد خــوای گــەورە دەفرمویــت: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ﴾[1]. واتـــە: (لەســـەرتان جـــەنگ نوسراوە دیارە جەنگیش شتێکی قورس و ناڕەحەتەو خۆشــتان لێینایە، دڵ و دەروون حەزی پێ ناکا).

کاتێك بەرگری لەخۆمان دەکەین یان دەچەنگین تا میللەتان ئاسوودەو ئەمان بن بەلاّم لەدڵماندا پێمان ناخۆشە.

---

[1] البقرة: ٢١٦ .

## پ- چاکەکردن لەگـەڵ غـەیر موسـڵمانەکان هـەر لەپێناو ئاشتی.

یەکێکی تر نابێ ئێمە لەبیر بکەین ئاشتی و چاکەیە لە گەڵ غەیری موسڵمان، ئەمە وئەوەش ئاشتیە، ئەمە بنەمای تێکدان نیە؟ بێگومان بنەمای ئاشتیە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ [1].

واتە: (خوا ڕێتان ناگری لەو کافرو بێباوەڕانەی جەنگیان نەکردوون لە ئاییندا، و لە ماڵ و زێدی خۆتان دەریان نەکردوون کەچاکەیان لەگەڵ بکەن و مامەڵەیان لە گەڵ بەکەن بە دادگەریی بەڕاستی خوای دادپەروەر، خەڵکانی دادپەروەری خۆش دەوێ).

ئێوە لەگەڵیان چاك بن ئێوە لە گەڵیان باشبن.

---

[1] الممتحنة: ٨ .

## ج-   یاساو قاعیدەی جیهاد کردن لەپێناو پاراستنی ژن و منداڵ و پەککەوتە.

ئینجا یاساکان دێنە سەر ئـەوەی کـە یاسـای دانـاوە بـۆ جیهاد کـردن، بـۆ دیفـاع کـردن لـە (المستضعف) لاوازو بــێ تواناکان، ئێستا ئەمڕۆ کـەس نیـە بـەرگری لـە موسـڵمانان بکات، ئەوەتە دەبینین لە دونیـا ئـەوەی لاوازو بــێ دەسـەڵاتە موسڵمانە چونکە جیهاد کـردن بـەپێوەری شـەرعی نـەماوە، بەڵام بـە و جیهـادەی بـە پێـوەری دەوڵـەت داری بـێ، نـەك هەرکەسێك لەولای هەستێتەوە بڵێ من جیهاد دەکـەم، وەکـو ئەوەی لەدرێژایی ئەم سەد ساڵەی کـە حـوکمی دیـنی خـودای تعالی نەماوە هەرکەس لەجێی خـۆی هەڵدەسـتێتەوە بـەناوی جیهاد فرقەیەك دادەنێن، بۆیو حاڵمان وایە، وەکو ئەوەی ئەو برایەش باسی کرد سووتەمەنی هـەرە گـەورە گەنجـە تێیـدا ، بۆیە قورئان یاسای دیفاع کردنی بۆ لاوازەکان دانـاوە، خـودای گـــــەورە دەفـــــەرموێ:﴿ وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ

أَخۡرِجۡنَا مِنۡ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهۡلُهَا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴾ [1]. واته: (ئه‌ی ئیمانداران! ئێوه به‌چ بههانه‌و بیانوویه‌ك ناچنه غه‌زا له‌ڕێی خوا، و له‌به‌ر رزگارکردنی پیاوان و ژنان و منداڵانی لاوازو چه‌وساوه‌و بێ دیفاع ئه‌وانه‌ی که ئه‌ڵێن: ئه‌ی په‌روه‌ردگاری ئێمه! تۆ له‌م شاره‌ی که دانیشتووه‌کانی سته‌مکارن رزگارمانکه, چونکه ئازاری زۆرمان ده‌ده‌ن و رێیشمان نادەن کۆچ بکه‌ین ده‌سا له‌لایه‌ن خۆته‌وه پشتیوان و کارسازێکمان بۆبه‌دی بێنه و هه‌رله‌لای خۆته‌وه -به‌فه‌زڵی خۆت- یارمه‌تیده‌رێکمان بۆبه‌دی بێنه).

## ح- یاسای پاراستنی گیانی مروڤه‌کان ته‌نانه‌ت له‌کاتی چه‌نکیشدا:

ئه‌وجا یاسایه‌ك بۆ پاراستنی منداڵ، بۆ پاراستنی ئافره‌ت

[1] النساء: ٧٥ .

و بەتەمـــەن و بەساڵاچـــووەکان، لـــەکاتی چـــەنگ ، ئـــەوەتا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ﴿انَّ رَسُـولَ اللَّـهِ قَالَ: انْطَلِقُـوا بِاسْـمِ اللَّـهِ ، وَبِاللَّـهِ وَعَلَـى مِلَّـةِ رَسُـولِ اللَّـهِ ، لا تَقْتُلُوا شَيْخًا فَانِيًا ، وَلا طِفْـلا ، وَلا صَـغِيرًا ، وَلا امْـرَأَةً ، وَلا تَغُلُّوا ، وَضُمُّوا غَنَائِمَكُمْ ، وَأَصْلِحُوا وَأَحْسِنُوا ، إِنَّ اللَّهَ يُحِـبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾[1] .

واتا: منـدالّ مـەکوژن و بچـووکەکان مـەکوژن و ئـافرەت مـــەکوژن وە هـــەروەها زیـــادە ڕەوی مەکـــەن هـــەروەها: دەفەرموێت: (وَأَصْلِحُوا وَأَحْسِـنُوا). ئێوە چاك بـن، پـاك بـن، ئاشتی بن، خودای گەورە موحسینی خۆشدەوێ ، جا بەڕاستی خاڵی کۆتایی لەم بابەتە کە دەمەوێ بچمە سەر بابـەتی دووەم ، ئەویش ئەویە کەئێمە لـەبیری نەکـەین قانوونێکمـان هەیـە یاسایەکمان هەیە ئیسلام دایناوە ئەویش.

---

[1] سنن ابو داود رقم (٢٦١٤).

## خ- یاسای نەهیشتنی شەڕو ئاشوب و فیتنه.

﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ ﴾[1].

واته: (ئێوەش ئـەی موسـڵمانان! بـەردەوام بەجـەنگ بـێن لەگەڵیان فإن انتهوا جا ئەگەر لەکاری خراپ و دزێوو شـیرك و کوفر دەسبەردار بوون).

## د- یاســـای نەهێشـــتنی دەســـتدرێژی و پاراســـتنی ستەملێکراوان:

﴿ وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾[2].

واته: (ئیوەش لەراهی خودا لەگەڵ ئەوکەسـانەدا بجـەنگێن که لەگەڵتان به جەنگ دێن و، ئەیانەوێ لـه سـەردانی مـاڵی

[1] البقرة: ١٩٣
[2] البقرة: ١٩٠.

خوا ڕێتـان لـێ بگـرن، بـەڵام وریـابن! نـابێ دەسـت درێـژیی وزیادەرەوی بکەن لەکاتی رووبەڕووبوونەوەو جەنگدا).

﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُـلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَـدِيرٌ ﴾ [1].واتە: (بڕیـارو مۆڵـەتی تۆڵەکردنـەوە دراوە بەرامبەر بەو ئیماندارانەی شەڕیان بەسەردا سەپێنراوە و جەنگیان لەگەڵکراوە - لەلایەن بێ بڕواکانەوە بەڕاستی خواش بۆ کۆمەك و یارمەتیدانیان زۆر بەتواناو بەهێزە).

## ژ- یاسای مرۆڤایەتی یەك خیزانە.

مرۆڤەکان یـە خیـزانن، قورئـان بەیـەك عائیلـە وەسـفی کردوین، خودای گەورە دەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٲحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالًا

---

[1] الحج: ٣٩.

﴿ كَثِيرًا وَنِسَآءً ﴾[1]. واتـــــە: (ئـــــەی خەڵكینـــــە! لـــــەو پەروەردگارەتان پەرواتان بێ و بترسن كە ئەو ئێوەی لـە تاكـە كەسـێك (ئـادەم) (علیـه السـلام) دروسـتكرد و هەرلـەو تاكەكەسـەش هاوسەرەكەشـی (حـەوا) دروسـتكرد، و لـەو دووانـەیش پیـاوانێكی زۆرو، ئافرەتـانێكی زۆری بـەدنیادا بڵاوكردەوە).

حەوت جار لەقورئان باسی عائیلە هاتووە لە نێوان ئادەم و حـەوا هـەموومانی بەیـەك عائیلـە لێكداوەتـەوە، هـەموو پێوەرەكانی خێزانی تێدایە چۆن؟ بـاوك ئـەوە ئادەمـە، دایـك ئەوە حەوایە، ناكرێ تۆ عائیلەیـەك دروسـتكەی لەسـەر زەوی دای نێیی دوای ئەوە بۆ خۆشت بچی بیكوژی و بیبڕی، نـەخێر شتی وا نیە بەهیچ شێوەیەك، بۆیە ئەوە ئـەو بنەمایانـەن كـە بەڕاستی نامەوێ زۆر قسە لەسەر ئەو بابەتـە بكـەم، ئەسـڵەن هیچ پێویست ناكات نە زانایان، نە خەڵكی موسڵمان بیر لـەوە

[1] النساء: ١.

بکاتەوە بەرگری لەخۆی بکـات بڵـێ ئیسـلام ئیرهـاب نیـە!!! ئیسلام ئەسڵەن هەرچی تێیدایە دژی ئیرهابەو قەتیش ئیرهابی دروست نەکردووە، لەمێژوی خۆشی ئەوەی باسی کراوە جارێك لە جاران ئەوەی جەنابی م.هاوژین باسی کرد کە خەواریجیەکان بوون ئەسڵّەن ئیسلام بەخۆی لێی دان نەفی کردن، لەناوی بردن، کە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئیسلام قبوڵی ئیرهاب و عونفی نیە.

## (وەڵامی دووەم باسـی توندرەویـە لەسەرچـاوەکانی خۆیان).

دێمە سەر بەشی دووەم بەڕاستی پێم خۆشـە کـە بەڕاسـتی جددی تر لە کاك هاوژین قسە بکەم.

تەبعەن نازانم کاك هاوژین نە خاتری مـنی گـرت نـە چـی بوو؟ پێم خۆشبوو بە راشـکاوی و بەسـەراحەت قسـە لەسـەر ئەوە بکا، لە سیکۆلار ئەوەی کە ئـەو ڕای لەسـەرە بۆچـوونی لەسـەرە، ئایـا بـەفعلی سـیکۆلار ئەمنیـەت و ئاسایشـی مرۆڤەکانی بەرجەستە کردووە؟ بەڕای بەندە ، نـەخێر، وانیـە!

چۆن؟جائێمه لەبیر نەکەین سـەرەتای شۆڕشـی فەڕەنسـی ئـەم شۆڕشه بە چوار پێـنج کتێـب کـە سەرچـاوەی خۆیانـە بۆتـان دەسەلمێنم کە دونیا وەك دەڵێی نووست بوو، ئیرهاب سەرەتای شۆڕشی فەڕەنسی بەرهەمی هێنا، لـە ڕوە زانسـتیەکەی زوری خزمەت کرد بەلاّم لە ڕووە ئینسانییەکەی بەڕاستی سەرچاوەی ئیرهابە، بەم بەلّگانە لە سەرچاوەکانی خۆیان دەیسەلمێنم:

١- زاراوەی ئیرهاب یەکێکە لە داهێنانـەکانی شۆڕشـی فەڕەنسـی، یـەکێ لەوانـەی کـە ئیعلانـی ئـەوەی کـرد ﴿ڕۆبسبێر﴾[1] بوو، تەبعەن حوکمی ئیرهابی دا لە فەڕەنسا لـە ساڵی (١٧٩٣ – ١٧٩٤) لەو فەترەیە میژوناسێکی گـەورەی فەرەنسی بەناوی ﴿دۆناڵـد غریـر﴾ دوایـی دێ قسـەی لەسـەر روبسپیر دەکات لە نوسراوەکانی خۆی بۆ نموونە دەڵێ: فەرەنسا (فرنسا اول دولة سیکولاریة الارهاب فی عصر الحدیث وبدایـة

(١) ماکسمیلیان روبسبیر ، ١٧٩٤ – ١٧٥٨، ثاریزةرو سیاسیةکی طةورةی شورشی فةرةنسی بوو.

عصر الابادة الجماعية)[1]. واتــە: (فەرەنسـا یەکـەم دەوڵـەتی ئیرهابی سـیکولارە لەسـەردەمی نوێـدا وەسـەرەتای چـەرخی پاکتاوی کومەلگوژیە).

دەبێ بیسەلمێنین بە سەرچاوەکانی خۆیان نەك هی ئێمە بـۆ ئەوەی نەڵێن ئەوە بوخاری یە ئەوە موسلمە ئـەوە زەعیفـە نـا مصادرەکانی خۆیان ...

٢- یەکێکی تر لەوانە کتێبێك بە ناوی (الإرهـاب: حـرب أهليـة في الثـورة الفرنسـية)، ئـەم کتێبـە لـە سـاڵی ٢٠٠٥ دەرچووە ، هەروەها ئەم کتێبە میژوناسێکی گەورەی مرموقی بەریتانی (دافيد أندرس)(٢)، نووسیوویەتی بۆیـە ئێسـتا ئـەم کتێبە زۆر باسی ئەوە دەکـات یەکـەم هۆلۆکوسـت لەچـەرخی سەردەم شۆڕشی فەرەنسی بوو، هـەروەها دەڵێـت لـەم فـەترە زەمەنیـە: (وقصـة أول هولوكوسـت في العصـر الحـديث، حيـث

(١) بڕوانە: التاريخ الأسود للثورة الفرنسية، ألبير سوبول ، جورج كوسي .
(٢) دافيد أندرسن، فەلەك ناس و فیزیاییەکی ئەمریکیە ، ١٩٠٥ – ١٩٩١.

كانت هذه الثورة في الحقيقة بداية عصر الإبادة الجماعية للمخالفين بالشكل الذي عرفه التاريخ الحديث.)[١].

واتە( بەسەرهاتی یەکەم هولوکوست بو لەچەرخی سەردەم، بەراستی ئەم شورشە سەرەتای دەست پی کردنی کومەلگوژی بوو بو نەیارەکانی بەشێوازیك کە میژوی ئەم سەردەمە ناسیویەتی). ئەمەی سەرەوە دەقی کتیبەکەیە نەقلم کردوە. - پرۆڤیسۆر (ئەلیکسندر غادی)[٢] ئوستازە لە زانکوی (سوربون)، دەڵێت: (حيث قال: أنه ليست: هناك كنيسة أو قصر أو مدينة في فرنسا لا تحمل آثار مثل هذا التخريب)[٣].

واتە: بەڕاستی کەنیسەیەك، یان قەسرێك یان شارێك نیە لەفەرەنسا شوینەواری تیکدان و کاولکاری پێوە دیار نەبێ).

(١) بروانە: الإرهاب: حرب أهلية في الثورة الفرنسية" میژوناسی بەریتانی، (دافيد أندرس) .

[٢] الثورة الفرنسية ملهما للطغاة. نوسەر: رافائيل بيهر.

[٣] التاريخ الأسود للثورة الفرنسية، نوسەر: ألبير سوبول ، نوسەر: جورج كوسي ، ترجمة.

٣ — لـەناوبردن و کومـەلوژی رەشـکردنەوەی ناوچـەو تویـژێك: بەنمونـە ناوچـەیەك هـەبوو بـەناوی (فندییـە) ی فەرەنسی ژمارەیان (٨١٥٠٠٠) هەزار کەس بوون، بەلای کەم ١١٧ هـەزار کەسـیان لـەناو بـرد لـەژن و منـدال و پـیر و پەککەوتە[1]! .

٥- توندرەوی و توقاندنی قەزائی.

بەناوی دادگای کردنەوە (٣٠) هەزار کەسـیان لەسـی دارە دا ژن و مندال و پەککەوتە ی تیدا بوو[2].

**(ئایـە سـیکولار یـان عەلمانیـەت ژیـانی داوەتـە مروڤایەتی لەم سەد ساڵەی لەحوکمە؟)**

**با بین هەر لـە ژیـانی خۆمـان سـی شـێواز لـەحوکمڕانی**

[1] بروانە: کتـابی "فانديـە — مـن الإبـادة الجماعيـة إلى إبـادة الـذاكرة، لرينالـد سيشير.

[2] التاريخ الأسود للثورة الفرنسية، نوسەر :رونو اسكاند.

**وەرگرین لە شێوازی عەلمانی ئایا سیکۆلار ، ئایە ژیانی داوەتە جیهان یان نا؟.**

**شێوازی یەکەم: شێوازی یەساری.**

شێوازی یەساری مان هەیە (چەپگەری سۆڤیەت) وەرن تەمەشای شێوازی یەساری بکەن

کە سۆڤیەت سەر پەریشتی دەکات، لاتان زانراوە ئیشتراکیەت بنەمایەکی سەرەکی نێو سیکولارە. ئەمەش بەدوو قوناغ دەست پێ دەکات:

**قۆناغی یەکەم: سەردەمی لینین.**

لینین سەرەتای توندرەوی لەماەیەکی کەمدا (١٣) هەزار کەسی بە (٣) مانگ گوشت.

**قوناغی دووەم: سەردەمی جوزیف ستالین.**

ئەم قوناغە توندتر بوو لەقوناغەکەی تر لەساڵی ١٩٣٦ زیاتر، ئەم قۆناغە توندتر بوو لە قۆناغەکەی تر لە ساڵی

(١٩٣٦)، (يقـول نيكيتـا خروشـوف أن القمـع الـذي مـارس ستالين على الشعب السوفياتى كان بمثابة الحتمية التاريخية)

تەنها لەقەوقاص دوو مليون و نيو كەسى گوشت.

**شێوازی دووەم: شێوازی دکتاتوریەت.**

هەردوو دەسەڵاتی فاشی ئیتالی و نازی ئەڵمانیەکان دەگرێتەوە ، بزوتنەوەی نازی بزوتنەوەیەکی عەلمانی سیکولاری دکتاتوریە، ئەم بزوتنەوەیە سەر بە ئیسلام نیە سەر بەعەلمانیەتە، (ومن الواجب أن نسير في قسوة لاهوادة فيها ولا رحمة ولا تردد ولا مثيل لها)[1].

دەڵێ: (ئەم جەنگەی کەدەست پێ دەکات نابێ هیچ نەرم ونیانی و رەحم و بەزەیی و دودڵی و تێدا بێ بەشێوازێك وینەی نەبێ).

---

[1] مذكرات : نيكيتا خروشوف.

به‌شیوازیك بیٚ نه‌ره‌حمی تیدابی، به‌وپـه‌ری دل ره‌قـی بـیٚ، ئایه ئه‌مـه عونفـه یـان ئیرهابـه؟ ئایـا مـن کردوومـه یـان بزوتنه‌وه‌یه‌کی نازی و عه‌لمانی.

هه‌رله چه‌نگه‌کانی ئه‌لمانیا له‌فه‌ره‌نسا ئه‌و چه‌نگه‌ی کـه‌کرا (٢٩) هه‌زار و (٦٦٠) که‌سی ده‌ست به‌سه‌ریان کوشت، هیچ که‌س ڕه‌هاین ناکوژی ئه‌وان ره‌هاینیان کوشت[1].

## شێوازی سێه‌م: سیسته‌می سـه‌رمایه‌داری عـه‌لمانی (الرأسمالية).

سیسته‌می سه‌رمایه‌داری ئیسـتا ئه‌مـه‌ریکا سه‌رپه‌رشـتی ده‌کات، ته‌بعه‌ن ئه‌مه‌ریکا ئه‌وه‌تا لـه هـیرۆ شـیماو ناکـازاکی له‌هه‌ردووکیان (٧٨١٥٠) هه‌زارکه‌س کوژرا، هـه‌روه‌ها (٤٠) هه‌زار که‌س بریندار بوون!، زیاتر له (١٤) هـه‌زار کـه‌س بـزر بوون . هـه‌ردوو چـه‌نگی جیهـانی یه‌کـه‌م و دووه‌م ئێمـه وه‌ك

[1] بروانة، تاريخ فرنسا المعاصر.

موسـلمان نـەمانکردوە، سـیکۆلار کردوویـەتی، عەلمانیـەت کردوویەتی، ئاخر خەڵك ئاور لە میژوو ناداتەوە هەموو ئاوڕی میژوومان چەنگی نیوان موعاویە و ئیمامی عەلی یە. ئەوەتا لە چەنگی جیهانی یەکەم ( ١٥ ) ملیـون و کـەس گـوژراوە، وەهەروەها لە چەنگی جیهانی دووەم ( ٥٤ ) ملیون کەس[1].

## ژمـارەی گـوژراوان و شـەهیدانی چـەنگەکانی سەردەمی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم).

لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی اللـه علیـه وسـلم) (٦٤) چەنگ کراوە ، بەپێوەر دەکاتە سەدا یەك و نیو خەلك کـوژرا، (٢٦٣) کـەس لەلایـەنی پیغەمبـەری خـوا شـەهید بـووە ، ئەویتریش (١٠٢٢) ئەوەندە کەس شەهید بووە[2].

---

(١) . https://ar.wikipedia.org/wiki/%

(٢) بروانە: ماذا قدم المسلمون للعالم ، دکتور، راغب السرجانی.

**پرسیاری پێشکەشکار: مامۆستا هاوژین دینەوە لای جەنابت بۆ وەڵام دانەوە نا ، بەڵکو بۆئاڵ و گۆڕی، یاخود بەواتایەکی تر بۆ مناقەشەکردن .**

**وەڵامی ماموستا هاوژین :** سوپاس بۆ تۆ ئاوا قسەدەکەین تۆزیك وشك بوون بەهەر حال ماموستا کۆمەڵێك شتی خستە ڕوو من هەوڵدەدەم بەدوای یەکەوە وەڵامیان بدەمەوە، ئیشکالەکە بڵێم لەکوییە بۆیە بەڕاستی کێشە گەورەکەی کەتێدایە یەکسان کردنی سیکۆلاریزم بەئیلحاد، خەڵکی سیکۆلار خەڵکی مولحید نین بەڕاستی وەك وتم مێژووی سیکۆلاریزم دەچێتەوە ناو ئاینی مەسیحی بۆ ناو سیکۆلۆژیای مەسیحی، بۆ بزوتنەوەی ریفرۆمی ئاینی، وە گرینگترین وەباشترین بیرمەندەکانی سیکۆلاریزم کەسانیکن کەبانگراوندی ئاینیان هەیە، بەنموونە: من ئاماژەم بە (جۆن لۆك)کردوە ئەم نامەی دەربارەی تەساموحی دینیە خۆی لەڕاستی دا چەند جار ئەوەی دووبارە کردوە عەلمانی بنەماکانی بریتیە لە باوڕنەبوون بە خوا هەندێك عەلمانی هەن باوەڕیان بە خودا نیە بەلاَم ڕەنگە بڵێم زوربەی زۆری عەلمانی

موئمینن باوەڕدارن، بەخوا بەس **موشکیلە ئەوەیە من بـاوەڕم بە خودایەکی تر هەیە** باوەڕم بەشیوەیەکە تۆ باوەڕت بە خوایە باوەڕم بە خودا نیە تومن بە مولحید دەزانی **لە نـاو قسـەکانی ماموستایا دینی خوا واتا ئیسلام ئە وە یە موشکیلە گە** ورە !!! مە سیحیە ت دینی خوایە، یەهودیـەت دیـنی خوایـە، وە هەموو ئاینەکانی تر دینی خوان، یـان نـا؟ وەتومـەتبارکردنی کەسی عەلمانی بە وەی کە کەسـێکی بـێ ئەخلاقـە ئـەوە زۆر کێشەکە گەورە ترە، وە ئێمە دەزانـین وە مـن حەزناکـەم مـن شتێك بلێم کە تۆزێك ئازار بەخش بێ، وەگرینگترین وباشترین کتیبەکان تیزەکان دەربارەی فەلسەفەی اخلاقە کە پە یوەندیان بـە شارسـتانیەتی ئیسـلامیەوە نیـە لـە ڕاسـتی یـا لـەم دوا دوایانەی سەدەی بیستەم دابو یەکەم جار دوو کتێب دەربـارەی بنـەمای اخـلاق دەنوسـری یـەکێکیان (عبـدالله دەراز)یـان (دەروزە )، هە ندی کەس دەڵێن واتای نوسـینی تیزەکـەی لـە (سوربون) نوسیوە. لەژیر فەلسەفەی ئەو کاتە بو یەکـەم جـار کتێبێـك دەربـارەی اخـلاق لەشارسـتانیەتی ئیسـلامی دا دەربـارەی زانسـتی اخـلاق دیتـە دەرەوە، کوناحـە ئێمـە وابیرکەینەوە ئەوکەسە کە موسـلمان نیـە خـوا ناناسـی، ئـەو کەسەی کـە موسـولمان نیـە اخلاقـی نیـە، ئـەو کەسـەی کـە

موسوڵمان نیە، عیبادەتی نیە، وە ئەو کەسەی کەموسولمان نیە شەریعەتی نیە، ئەوا بە تەسەوری من موشکیلەی گەورەن، ئیمە هەر ئیستا بۆ خومان ئەم دونیایی هاوچەرخ رەنگە باشترین نمونە بێ، بەرێزان زوربەی زۆری خەڵکە بیروباوەڕە جیاوازەکان بە موسلمانە زۆر مولتەزیم و پابەندیەکانیەوە لەهەندێك سەرانی توندڕەوی ئیسلامیشەوە لەرۆژئاوا حەسانەوە، لە ڕۆژئاوا دانیشتوون، لە ڕۆژئاوا دەپارێزرێن، لە ڕۆژئاوا ڕێزیان لیێ دەگیرێ، وە ئەوەی ڕێز لە جیاوازی ناگرێ، ئەوەی کە ڕێز تەنانەت ڕێز لە موسڵمانەکەی تریش ناگرێ کە وەکو وتم بەو (ئوسوتوکیسییەتەی ) ناڕوا بەرێوە، ئەوە ئێمەی موسڵمانین یەعنی ئەوەی کە کەم نین، ئەو کەسانەی لەناو کۆمەڵگا ئیسلامیەکان جیگەیان نابێتەوە ڕۆیشتون لە دەرەوە ئێستا لە ڕۆژئاوایە حەوانەتەوە، وەحەتا تێکەڵ کردنی شورشی فەرەنسی وە کومەلێك کێشە لە شورشی فەرەنسی کە تیای روویداوە بەمیژووی عەلمانیەت ئەوەش موشکیلەیەکی گەورەیە، شورشی فەرەنسی شورشیك بوە دژی ئوسولسی ئاینی، دژی ستەم و با بلێن بێ مانایی زۆر پیاوانی ئاینی لەگەل پیاوانی دەسەلات، دەسەلات دەستیان تێکەڵ کردووە بەرامبەر بەمیلەتانی خویان بەرامبەر کومەڵگای فەرەنسی و

مومارەسەیان کردوە، وە ئەمە بۆتە سەبەبی ئەمەی کە لەناو شۆرشی فەرەنسیا فەزاحەیەکی توونـد بەرامبەر بە ئەو تەسورە دینیەی بێتە دەرەوە، کە دەستی تێکەل کردوە لەگەڵ دەسەلاتی سیاسی، یەعنی من هەر بەنموونە یەکێك لەو کتیبانەی بۆ مامۆستام هێناوە بەدیاری کتێبێکی، (علی عبدولرەزاقە) من و کاکە ئارامی هاوڕێم تەرجومەمان کردوە بۆ زمانی کوردی (علی عبدولرەزاق) قازی شەرعی مصرە، فەلسەفەی ئیسلامی خویندوە، شەریعەی ئیسلامی خویندوە، باش نیە ئەم پیاوە دیفاع لە عەلمانیەت دەکات، دیفاع لە سیکۆلاریزم دەکات، وە نەقدی ئەزمونی خەلافەتی ئیسلامی دەکات نەقدێکی زۆر توندیش ، ئایا ئەم پیاوە کافرە؟ لەبەر ئەوە ئێمە بەڕاستی جیاکاریەکی گەورە بکەین لەنیوان یلحاد لەگەڵ سیکۆلاریزم ، من وتم فۆرمێك لەکاتی مومارەسەی عیلاقەی بەتیۆریەوە نیە عیلاقەی بە پراکتیکیەوە هەیە، مەسەلەن مەنزومەی عەلمانی فەرەنسی مەنزومەیەکی توندە لە براکتیکا، تا ئەندازەیەك لەپرۆسەی سیکۆلاریزمیش لەپرۆسەی سیکۆلارکردنی کۆمەلگا، باشە ئەم پرۆسەیە هەندێ جار بەرکۆمەلێك عادات، کۆمەلێك تەقالید، کۆمەلێك بیروباوڕی ئاینی دیاری کراو کەوتوە، کەهەتا

لەئەزمونی بۆ نموونە لـە ئـەزمونی تـورکیش ئـەزمونیك بـوو ئەوەرۆیشـت وەلازمـە چـاوەری بـارودۆخیکی تـر بکـەین، لەومۆدیلـە ئیسـتفادەی کـردوە، بـو نمونـە لەهـەردوو ولات مەوزوعی حیجاب بوو بە قەزیە باشنیە، ئەمە سـیکۆلاریزمە لەکاتی سـیکۆلاریزم کـردن واتـا لـەکاتی بـەدونیایی کردنـی سیکتەرە جیاوازەکانی کۆمەڵگایـە دەکـرێ هەنـدێ ئیشـکال دروسـت بـێ، وە هـەروەها لـەناو سـیکۆلاریزم خۆیـەوە بەرەخنەکراوە، بەلاّم تۆ بێی هەموو میژووی ئیلحاد مەسەلەن ببەستیەوە بە ئەم هەموو توندووتیژیانەی لـەدەرەوەی دونیـای ئیسلام بەتایبەتی مەسـەلەن کـەڕویان داوە، هـەموو بکەینـە کۆڵی سیکۆلاریزم، بەتەسەوڕی مـن هەڵەیـەکی مەنهەجیـە و شتێکی خراپـە، وەکـو وتم مەسـەلەکە پرەنسـیپە وەمەبدەئـە وبنەما گرینگەکانە ، سـیکۆلاریزم بریتیـە لـە بـێ لایـەنی و پۆزەتیڤیەکی ئیجابی بەرامبەر بە ئـەو جیـاوازی و ململانـی سیاسـی و ئایـدولۆژی و دینیانـەی کـە لـەناو واقیعـی کۆمەلایەتی داهەیە .

باشە دەولەت ئیشی ئەوە نیە کە ئیمە بەرەو ئاراسـتەیەکی ئالۆزیەکی دیاری کراو بەرێ دەوڵەت ئیشی ئەوەیـە کـەڕێگای

بەهەشت نیشانی ئیمە بدات؟ ئەمە ئیشی دەولەت نیە، ئینجا ڕێگای بەهەشت بەپێی ئیسلام؟ بەپێی مەسیحیەت ، ڕێگای بەهەشت بەبوزی بەپێی (کۆنفوشیزم)؟ یاخۆت ڕێگای بەهەشت بەپێی ئایدولۆژیای مارکسی؟ تەبعەن دەوڵەتی ئایدۆلۆژی وە دەیان دیراساتی عەلمانی لەسەر ئەم موشکیلەیە قسە ئەکا، دەولەتی ئایدۆلۆژی هاوشێوەی دەوڵەتی دینییە لەناو فکری سیکۆلاریا.

باشە **ئەزمونی نازی ئەزموونێکی سیکۆلار نیە،** ئەزمونێکی عەلمانی نیە، ئەزمونێکی ڕەنگە مولحیدو بیدین و بی باوەرو دژ بە سامی و جولەکە تەواوە، بەلاّم ئەزمونێکی عەلمانی نیە! هەموو ئەزمونیکێ مولحیدو ئەزمونیکێ بێ دین و وئەزموونیکی نا ئیسلامی ئەزمونیکی عەلمانی نیە، ئەوەیە موشکیلەکە بەتەسەوری من کە دەبوایە مامۆستا وورتر لەسەری بوەستایە.

زۆری قسە لەسەر ئەوە کرد مامۆستا خوای گەوەرە ، وە کۆمەڵێك ئایەتی پیرۆزی هینایەوە لەسەر ئەوە کە کوشتنی

خەڵك چەند قورسە وانیە: (مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا )، بەڵاّم ئەم کەسانەی ئەم ئایەتانەیان بۆ هاتۆتە خوارەوە خۆیان خۆیانیان کوشتوە، یەك خەلیفەی ئیسلام بەمەرگی خۆیان نەمردون، چوار خەلیفە راشییدین کە بەتایبەت مەبەستمە، وە منیش نەم کوشتوە، تەسەور ناکەم مەسیحی و جولەکەو مەجوسی وە لو باسی ئەوە دەکرێ، بەڵاّم موسڵمانان کوشتویانن، لەبەینی حەزرەتی (عەلی) و (معاویە ) یا (١٢) هەزار کەس کوژراوە بەپیێ سەرچاوەکانی: (ابن اثیر و ابن کثیر)، لەسەرچاوەی خۆیان باسیان کردوە، لەبەینی عائیشە دایکی موسلمانان و حەزرەتی عەلی یا چەندین هەزار کەس کوژراوە، لەزمنیان دوو صحابەی عەشەرە موبەشرەن، من وەکو ووتم تەسەور دەکەم موشکیلە لەلای جۆری ئەو بیر کردنەوەیە بێ، لەگەل ریزو خۆشەویستیم لەناو بیرکردنەوەی مامۆستا شا ئەبینم، وەکو وتم یەکێك لەڕیشەکانی توندوتیژیە، کەئەمە یەکێك لەرستەکانی سەر ئەکێشی بەرەو ئیرهاب، ئەوەکە من پیم وابی خودا یەك دینی هەیە ناوی

ئیسلامە، وە ئیسلامیش یەك ریگایە، کەمن بیری لی دەکەمەوە کەمن باوڕم پیّ یەتی ، (ئەرسۆزوکیەکی )دیاری کراوە، ئەمە موشکیلە گەورەیە، وە پیّت وابی ئەوەی کەدینی موسلمان نیە، نەخوا ئەناسی نەئەخلاقی هەیە، نەدەچیتە بەهەشت، وەئەوەی لەناو ئیسلامیش دا بەو ئاراستە (ئەرسۆ دوکسیە )، بەو فرقە ناجیە، من بیری پیّ دەکەمەوە ئەو بیری پیّ ناکاتەوە ، ئەویش ئەهلی بیدعەیە، ئەهلی زەلاڵەتە ، کە ئەوانەی وتم عونفی لەفزین لەراستیدا یەعنی من پیم وابیّ گەورەترین توندوتیژی تەبعەن دەبیتە هۆی سەربەز٠

(تۆ ئەت ویست قسە بکەی ببورە ).

**وتەی پیشکەشکار:** یەك موداخەلەم هەبوو لەسەرئەوەوتت ئەم ئایاتانەی کەهاتۆتە خوارەوە ئەوئایەتانەی خوای گەورە ناردی ئیشکالەکە لەمرۆڤ دایە یاخود ئایەتەکە بەشیکە لەپەروەردە کردنی بیری توندرەی دەمەی کورتە وەلاٚمێکی ئەوەم دەست کەویّ؟.

**وەلاٚمی ماموستا هاوژین:** تەبعەن لەبەر ئەوەی من

بانگراوندێکی (سۆسۆلۆژیشم) هەیـە، لەڕاسـتیدا وە لەبەشـی سۆسۆلوژی دەرس دەڵێمـەوە ، ئـەم جیاکاریـە بـۆ مـن هـیچ مانایەکی نیە، وە لەزۆر رووی زانستیەوە ناتوانم بەهەند وەری بگرم، من باسی زاهیرەیەکی مێژوویی دەکەم، باسی واقعێکـی کەلتوری کۆمەڵایەتی پەرەسەندو دەکەم،

ئەوتا لەناو واقیعی کومەلایەتی، واقیعی مێژووی، واقیعی سیاسـی یـە باشـە وە مـومکین نیـە ئـەو دەقانـە ئەگـەر موشکیلەیان تیدا نەبێ وە بەم شێوەیە (مانی فێست) بیت لەم واقیعە باشە، مەسەلەن ڕاستە ئایەتمان هەیە کە بەم شـیوەیە دەفەرمووێ کە مامۆستا باسـی کـرد، بـەلام ئـەوتا ئایـەتمان هەیە ئەفەرمووی:﴿ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ ﴾.

واتە: (دەسا ئێوەش بە توندی لەملیاندەن ) .

ریك باسی ریقـاب، لـەمل دان دەکـات، باشـنیە ﴿ وَٱضۡرِبُواْ

مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ﴾[1]. واتە: (و هەموو پەنجەو سەر پەنجەکانیان بپەڕێنن )، ئایەتەکەم باش بیر نەماوە ، (وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ ) لەقورئان هەیە،( فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ ) لە قورئانا هەیە، بڕینی دەستی دز لە قورئان هەیە، ئەوجە ماموستا ئەو ئایەتەی کە فەرمووی ماموستا چی دەکات لە سزای مورتەد لەناو شەریعەی ئیسلامیدا ، چی ئەکەی لەعقوبەی زانی لەناو شەریعەتی ئیسلامی دا باشە.

ئایە ئەمانە قەتلی نەفسە یان قەتلی نەفس نیە؟ لەدیدی منەوە ئەمە قەتلی نەفسە، من بیرو باوەڕەکەم من ئەگەر موسلمان نەبم، کافر بم، بەپێی ئیسلام بەپێی شەریعەتی ئیسلامی دەبێ بکوژرێم، باشە تۆ ئەم دەقە گشتیە دێنی دوای چۆن تەحکیمی پێ دەکەی لەواقیعی کۆمەلایەتی، بێ گومان نصوصی تەشریعی زۆرو زەبەنمان هەیە، حدودمان هەیە، لەئیسلامدا موشکیلە گەورەکە بەتەصوری من

[1] الأنفال: ١٢ .

بەڕاستی بریتیە لەبەشێکی زۆری تەبعەن لەقسەکانم مەجالم زۆر نەبو زۆر لەسەری شی کردنەوەی زیاتر بەم، یان لەسەری برۆم، بەشێکی زۆری پەیوەندی بەشەریعەی ئیسلامیەوەیە هەیە، **شەریعەی ئیسلامی بەڵا گەورەکەیە** !!! وە ئەو حەرەکاتە ئاینیەی کەدواییی باس لەتحکیمی بەیعەتی ئیسلامی دەکەن دواجار دڵنیام بەرەو ئیرهاب دەڕۆن باشە. ئێمە دەمانەوێ کومەڵگایەك بەرێوە ببەین، کۆمەڵگایەك ئیدارە بەین، کە ئەم کۆمەڵگایە پێك هاتووە لە کۆمەلێك خەڵك کە پێیان دەگوترێ هاولاتی باشە، ئەم هاولاتیانە هەر یەکی دینك و بیرو باوەرێکی جیاوازیان ئە شی هەبێ، هەریەکە مەزهەبێکی جیاوازیان ئە شی هە بێ باش نیە، کە مادەم دەکرێ خەرکی (ئاتەریست ) و بێ باوەڕیشیان تیدابێ، لەبەر ئەوە بەزەرورەت و پیویستە ئەو دەوڵەتە کە حوکمی ئێمە دەکات، لەکاتیکدا کە ئیمە هەموو (کۆمپلیت)ی موسلمان نین، هەموومان (کۆمپلیت) ی سەلەفی نین، هەموو مان (کومپلیت) ی مەسەلەن شافیعی مەزهەب و سەر بە بیرو باوەڕێکی ئاینی دیاری کراو نین، **ئەم دەوڵەتە پێویستە**

**دەولەتێکی سیکولار بێ ، دەبێ دەولەتێکی بــێ دیــن بێ**، بێ مەزهەب بێ ، نەك دژی دین، دژی مەزهــەب، باشــە لەزمانی کوردی دا تۆ ئەم موشکیلەکەمان هەیە مەسەلەن لە زمانی ئینگلیزی دا ئەم جیاکردنەی باشتر هەیــە، یــەعنی دژە دین لەگەڵ لایەنگری دین، لەگەڵ بــێ دیــن، یــەعنی کەســێك کەدینی نیە، نەلای ئەم لای گرتــووە، نــەلای ئــەو لای گرتــوە باشە. ئەگەر ئەمانە جیابکەینەوە لەم سی ئاســتە مــن نــاڵیم دەوڵەت، وە هــیچ ســیکولارێك هەڵــەی وای نــەکردووە، هــەر کەسێك هەڵەی وا بکات سیکولار نیە، بە تەسەوڕی من لەناو هــەموو مێــژووی ســیکولاریزما مــومکین نیــە مونــەزیریکی سیکولاریزم بدوزینەوە، بلێ وەزیفەی دەوڵەتــە دژایــەتی دیــن بکات موکین نیــە، ئەمــە هەڵەیــەك بوهتــانکی زور گەوریــە بــەناوی ســـیکولاریزمەوە، ئــەکرێ ســـیکولاریزم پرەنســـیپە ئەساسیەکەی بریتیە لەوەی کەدەوڵەت نــابێ لایــەنگری هــیچ دینێك بێ، دەوڵەت دەبێ ئــەو مەســاحەی کــە پێویســتە بــی پارێزی، وەکو یەك بیپاریزێ لە پەیوەندیا لەهەموو ئاینــەکان، بەهــەموو ئایــدولوژیاکان، بەهــەموو ســتایلە جیاوازەکانــەوە باشە. تۆ موسلمانی بۆ خۆت موسڵمانی ئەویش مەسیحیە بۆ

خۆی مەسیحیە، ئەویش جولەکەیە بۆ خۆی جولەکەیـە لـەناو ئیسلاما، ئەوە شافعیە، ئەوە حەنەفیە، ئەوە شـیعەیە، ئـەوە سونەیە، هەمووتان دەرکەت دەبێ بەیەك چاو سەیریان بکات، وە پرەنسیپی عەلمانیەتی باسی دونیا گەرایی دەکـات، کـەمن ئامــاژەم پــێ دا مامۆســتا توزیــك بــە هینکــی زیــاتروە بەتەسەوەری من شێواندنێ تێدا کردد، زۆر راستە سیکولاریزم یەعنی دونیاگەرایی، یەعنی ژیان لەم دونیایەدا عیلاقەی مــن وتۆ عیلاقەیەك لەسەر ئەساسی ئیسـتا و ئێـرە، نـەك لەسـەر ئەساسی دوایی کەمردی بۆکوێ دەرۆی، مــن بــۆ کـوێ دەڕۆم تۆ شەڕی ئەو دونیایی خۆت بەمن نافرۆشـی، منـیش شـەری دونیــایی خــۆم بــە تــۆ نافرۆشــم، ئێمــە لێــرە وەك هاوڵــاتی لەجوگرافیایەکی سیاســی کۆمەلایێــەتی مــاددی مەعنــەوەی دیاری کراوە، کەپێی دەوترێ حەیاتی دونیا، پێکەوە دەژیــن ، وە لەگەل یەك هــەڵ دەکــەین، وە دەبــێ مەســافەی یەکســان، ئازادی یەکسان، مافی یەکسانمان هــەبێ، بەرامبــەر بەیــەکتر، ئــەوە موختەســەر موفیــد، بەتەســەوری مــن جەوهــەری عەلمانیەتە باشە. وەکو ووتم پیاوانی ئاینی من باسی تەرقیــەم کــردووە لەســەر ئــەوە، یــەکێك لــە موفــەکیرە ســیکولارەکان

بەقەناعەتی من کە چەند بیرمەندێکی عەرەبیش رەنگە بڵێیم هەمان تەرقیەیان کردبێ باشنیە، کەزور پێش ئەوەی باباڵێن کەباسی سەقفی میژوی ئەوانە بکەین، رەوتی سیکولاریزم لەناو غەربا سەری هەلداوە دیفاعی لێ کردوە یەك لەوانە(ابن روشدە). (ابن روشد) کتیبیکی هەیە بەناوی (فصل المقال فیما بين الحكمة والشريعة من الاتصال)، زۆر بە قوڵی باسی ئەوە دەکات کاتێك دەوڵەت دەبێ بەهەڵگری تەسەوریکی کەلامی دیاری کراوە، وەکو ئەوەی کە موعتەزیلە کردیان دوای کەوتنەلەڕاوە دونانی حەنەفیەکان ، وەدوایی حەنەفیەکان دیسان بەرامبەر ئەوان دووبارەیان کردوە چ مشکیلەك دروست دەبێ، یەعنی کەڵکەڵەی عەلمانی، ئەسڵەن کەڵکەڵەیەکە خۆی وەکو وتم بەراستی لەناو فکری دینیەوە هاتوتە دەرەوە، وە لەناو ئەو تەسەورە هاتوتە دەروە کەئیمە ئەو دونیا هەیە عەزیزم خودای گەورە لەمن دەپرسی کە من ئیمانم هەیە؟ یان نیمە؟ بۆ بەهەشت دەجم یان جەهەننەم؟ دونیا داری امتحانە، داری تاقی کردنەوەیە، **من ئەتوانم لەم دونیایە کافربم** ، وە ئەوە حەقی ئیلاهی منە، تۆ ناتوانی لێم زەوتکەی، وە هیچ دەوڵەتێك نابێ ئەمەم لێ زەوت کات، وە ئەوی ئەمەم لێ

زەوت دەکات، بە تەسەوری من دژایەتی بۆ سەر حەقێکی ئیلاهی من دەکات **تۆ لێرە ناهێڵی کافربم**!!! لەو دونیاش ئەم خەیتە جەهەنەمەوە نابیت ئەمە یەعنی مەسەلەی ئەوی :
﴿ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ﴾.

واتە: (کێ باوەڕدێنێ و موسڵمان دەبێ، با بڕوا بێنێ، کێش دەیەوێ کافرو بێ بڕوا بێت، باهەر کافربێت).
ئەوە حەقێکی ئایینی موقەدەسی ئینسانە، بەتەسەوری من وەکو ووتم بەتەسەوری من ئیستا لەجەوهەری موشکیلەکە قسە دەکەین، کاتێك هێزێکی تەبعەن ئەم کێشانەی بەسەر مێژووی شارستانیەتی موسمانانا داهاتووە ڕۆڵێکی زۆر گەورەی هەیە کە ئینسانی موسڵمان لەوێوە کە دەیەوی بڕواتە دەروە دواتر داخیلی دەرگاو دەروازەکانی توندرەوی توندو تیژی دەبنەوە، وەکو ووتم مستەوایاتی جیاوازی هەیە توندڕەوی هەیە، توندڕەوی نەفسە، من لە دڵی خۆما حەز دەکەم ملی تۆ هەرقرتێنم، یان حەزدەکەم نەبی، من بەتۆ دەڵێم ئەمە بەدرەوشتە، ئەوە سەر لێ شێواوە، خوا هیدایەتی بدات. دوو

سەرکردەی سیاسی خۆمان لەسەر وشەی خـودا هیدایـەتی بـا بوو بە شەڕیان حەز ناکەم ناویان بێنم هەندێ جار بـە یـەکێك دەڵێ خوا هیدایەتت بدات، وەکو ئەو وایە بڵێ خوابت کـوژی، وەکو ئەوە وایـە بڵـێ تـۆ لەسـەر رێـی زەلالـەتی، مفهـوم و مخالفەکەی ئەوەیە، کێشە گەورەکـە بەتەسـەوری مـن بریتیـە لەمـە چـۆن زهینیـەتی خومـان پـاك دەکەینـەوە، کـە ئێمـە ڕاسترین مروڤ، باشترین مروڤ، ئێمە سـەرکەوترین مـروڤ بـین لەبوونا، وەکو ئەوەی من بیری لێدەکەمـەوە تاکـە حەقیقـەت نیـە، برولاریـزم کـە یـەکیك لەبنـەماکامی سـیکولاریزمە بەتەسەوری من شتێکە خۆ لـەناو تەسـەوراتی دیـنی هاتوتـە دەرەوە، بەڕاستی ئـەوەی کـە بـۆ مـن گرینگـە بوئێـوە بـو ماموستایی بەرێزیش تەنها لەم دیبەیتە بتـوانم ئـەو فکرەیـە وەك خۆی بگەیەنم، بەلامـەوە شـتێکی زۆر گرینگـە، بریتیـە لەوەی سیکولاریزم بییرۆکەیەکی بـە دەرەجەیـەکی امتیـازی زۆر ئاینی یە، وە لە ناو بیرکردنەوەی ئایینی سیکولار هاتوتـە دەرەوە، بەر لـەوەی لـەناو ئیلحـادەوە هاتبێتـە دەرەوە، وەك بەڕاستی ئێمە بۆ نمونە مەسـەلەن باسـی لەیاسـای پاراسـتنی

منداڵ، یاسای پاراستنی ژن، یاسای پاراستنی ئەم جۆرە شتانە دە کەین، دەبی تۆزیك مێژوویی و تۆزێك واقیعی و تۆزێك منتقیش بیرکەینەوە، کە ئەم یاسایانە هەمووی هالە رۆژئاوا دەرچون، وە لە رۆژئاوا بەرقەرار و بەکار و پەیرەو دەکری، وە ئێمەی موسڵمان نەمان توانیوە ئەم یاسایانە دەرکەین، وە ئیستاش لەگەڵ کۆمەلێك قەوانینە کە پەیوندی بەمافی ژنەوە هەیە ، تەنانەت پەیوەندی بە مافی منداڵەوە هەیە، موشکیلە نیە، ئەو شەڕو فەرتەنەیە چی بوو لەسەر ئیتفاقاتی توندو تیژی ژن، توندو تیژی مندال ،توندوتیژی دژی کەمینەکانی تر دونیای ئیسلامی دروست دەبی، ئیستاش ئیمەی موسلمان موشکیلەمان لەگەل مافە کانی مرۆڤە (دیسکۆزی )مافەکانی مرۆڤ دا هەیە، بۆ؟ لەبەر ئەوەی زهنیەتمان هەندێ ماف هەیە قەبوولی ناکات.

## بەشی دووەم دکتۆر: إدريس:

سوپاست دەکەم جا من پێم خۆشە ئەم بابەتەشت بـۆ شـی دەکەمەوە بەڵاْم پێشتر دەمەوێ ئاماژە بەوەش بکەم ئەوەندەی لێرە ئێمە باسی قانون و یاساکانی پێکەوە ژیانم کردوە، باسـی بابەتی کفر و ئیمانم نەکردووە، پێم خۆش بوو کەوە تومـەتبار کردنی تیدا نەبی، چونکە دوو شت هەیە: بروانەبوون شتیکە ، پێکەوە ژیان شتیکی ترە، ئەتۆ کەسـێکی یـان مـن کەسـێکم بروام نییە قورئان قاعیدەی بۆ داناوە : ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾[1].

من زۆرت لێ ناکەم کە تۆ ئیمـان بهێنـی وە تـۆش زۆری لەمن ناکەی ئیمان بهینم ئەوە قاعیدەیەکە.

**یەکەم:** بەلام پێکەوە ژیان قورئان چەسـپاندویەتی کـەدەبی پیکەوە بژین، وە جگە لەوەش هەتا ئیسلام حـاکم بـووە ئـاوڕ بدەوەو تەماشا بکە هەموو ئەو کەنیسەو مەعابیـدو تـەواوی

---

[1] البقرة: ٢٥٦.

ئەو ئەفکارانەی کەجەنابت ئاماژەی پی دەکەی هەمووی لەژێر سولتەو دەسەلاتی ئیسلامی دا بوونی هەبووە، پاکتاوی رەگەزی نەکراوە، پاکتاوی جنسی نەکراوە، ئەفکاریشی لێ قەدەغە نەکراوە، کەچی ئەوەتا شۆرشەکانی سیکۆلار لەجیهانا پاکتاوی کردوە، چەند نموونەم بۆ هینابییەوە، ئەوەیەك.

**دووەم:** لە سەدەی ناوەراست (٣٥٠) تا (٤٠٠) هەزار کەس لە جولەکەکان خەلکی ئەوروپا هاتن لەئەستەمبول لەژیر دەسەلاتی عوسمانیدا ژیان، ئێستاش حالێان دەبینی، ئەو دەسەلاتدارانەی ئێمە هەر لەکوردستان تا دەگاتە رۆژهەلاتی ناوەراست هەموو ئەوانەی کە باسی دەستووری حەیاتی دەکەن، بەوەی کە سیکۆلارن، فەرموو ئەگەر لەدائیرەیەك یەکێك ئاراستەی هەمان ئاراستەی حیزبەکەی نەبیت، پاکتاوی فیکری بۆدەکات، ئەوا خۆ واقیعە لەولاتی خۆمان، بۆیە منیش بەڕاشکاوی دەیلێم حکومەتی عێراقی دەیگوت (امة عربیة واحدة)، بناغەی لەسەر ئەوە بوو: (وحدة حریة اشتراکیة)، کە بنەمای ئیشتراکیەت بنەمای عەلمانیەت تەمەشا دەکەین دەبایە خەلکی ئەو کوردستانە، یان دەبایە بچیتە دەری پیشمەرگایەتی بکات، یان دەبایە پاکتاوی فکری

لەسەر بکرێ، ئەوە کاکە ئێمە نـەمان کـردوە، واتـا میـژووی ئیسلام شاهیدە لەسەر ئـەوە، ئـەوەتا عـەینکاوە لـە پیشـت مانە، هەتا ئیسلام هـەبوو رۆژ بـە رۆژ فـراوانتر بـووە، قـەت رۆژیك پاکتـاوی رەگـەزی لەسـەر عـەینکاوە نـەکراوە، ئـەوە هەرموّتە لە کوێی هەبووە رۆژ بە رۆژ گەشەی کردووە، وە لـە هەموو شوینەکان مەعبدیان هـە بـووە قـەت قـەت پاکتـاوی رەگەزی نەکراون، ئیستاشی لەگەڵ دابێ.

**ئەصل لەئیسلام** دیفاع بووە، هـەتا لـە جیهـاد کـردنیش هەوڵدراوە کەسـێکی ئـەهلی غێـر فکـری ئیسـلامیش وەکـو موسـڵمان بپاریزرێـت، ئەمـە حقیقەتێکـە ئێمـە نـابێ ئـەوە بشوینین، من وابیر بکەمەوە لەبەر ئەوەی فلان کـەس بـاوەڕی بە شەریعەتی ئیسلامی نیە ئیلا دەبـی بیکـوژم، ئێمـە شـتی وامـــان نـــەگوتوە ناشـــیلێن، ئیســـلام نـــالێ بیـــانگوژن وە نەشیگوتوە. تێگەیشتنێك هەیە دەبێ راستبکرێتەوە لـەبارەی ناوو بەکار هێنانی (کـوفر )، ئـەویش بـەکار هێنـانی وشـەی کوفرە، چۆن ئێستا من بە کەسـێکی غـەیر موسـڵمان دەڵـێم باوەری نیە، ئەویش بەمن دەڵی باوەڕی نیـە، چـونکە ئێسـتا من باوەڕم بەوە نیە عیسا (علیە سلام ) کوڕی خودایە، لەلای

ئەو من بێ باوەڕم واتە (کافرم ) بەدینی ئەو، کەواتە هــەردوو ڕەئی یەکە لەکوتاییدا عەلەمێکە ناوێکــە، ناونیشــانێکە بــۆ کەسەکە.

بەڕاستی ئێمە وەك موسڵمان گرفتمان لەسەر ئەمەیــە کــە دوو شـــت تێکـــەڵ دەکـــەین هەنـــدێك جـــار کـــارو کـــردوەی موسلمانێك یان بزوتنەوەیەکی ئیسلامی تێکەڵ دەکەین لەگەڵ خــودی ئیســـلام، ئەگــەر ئــەومان قــەبول بێــت باشــە، ئــەو بزوتنەوانەی ئیستا هەنە لە ئــەوروپا، ڕاســت و چــەپ تێکــەڵ دەکەن و دەسوتێنن، ئایــا ئــەتۆ رازی بڵــێن ئــەوە لــە زمــنی بزوتنەوەیەکی عەلمانین، بێگومان دەڵێی نەخێر، دیموکراســیەت جوانترین بنــەمایی تێدایــە لــە دادپــەروەری و لــە کۆمــەڵێك پرەنسیپی جوان پێکهاتوە، بەڵام تەماشا دەکــەی حیزبــەکانی ئێمە هەرچی بنــەماکانی دیموکراســیە نــای کــەن، ئایــا ئــەوە خەتای دیموکراسیەتە، یان خەتایی خەڵکەکەیە، بەڵێ مــن دان بەوە دەنێم خەڵکی موسڵمان هەیە بەڵی غەڵەت دەکات بــەڵی خەڵکی کوشتوە!!!. بەڵام کەی ئەو کاتەی کە دەبینی:

١- لە ئەمریکا لە گوانتانامو قورئــان دەســوتێنیێ!!!. بــۆ

ئەوەی پەرچە کردار دروست ببیَ.

٢- لە سویسرا کـە دەنگـی (اللـە اکـبر) ی لـیَ قەدەغــە دەکات.

٣- لە فەرەنسا بە پێـی بڕیـاری دەوڵــەتی فەرەنســی کـە تاکــە دەوڵەتــە یاســاکانی عەلمانیــەتی تێــدا داڕێــژراوە، بیدایەتی دەوڵــەتی عەلمانیــە ،حیجـاب لــە نــاو تــاکێکی موسڵمان، لە نێو زانکۆ لەناو گە نجان لەسەری دەکاتــەوە، لەوێوە توند رەوی دروست دەبیَ.

٤- لە دانیمارك بە پیی یاسایی رۆژنامەوانی نابیَ نارێکی و نارێزی لەگەڵ هیچ کەس بکریَ لەگەڵ پێغەمبەری خودا (صلی الله وعلیه وسلم) دەکری، ئینجا توندڕەوی دروســت دەبی، واتە بەشێك لەو توندرەویانەی لەجیهانی ئیســلامی روو دەدەن ئیلا سەرچاوەکەی بۆ ئەوان دەگەرێتەوە، وەبــە بەڕاشکاوی دەڵیم و قەتیش شەرمم لەمە نــەکردووە بــەلاَم لەگەڵ ئەوش دا دیسان اعتراف دەکەم موسلمانیش هەڵــەی کردوە، ئێمە لە ئیمامی ئەبوبەکرەوە لــەدوای پیغەمبــەر (

صلى الله عليه وسلم ) کەس لەو گەورە تر نیە، لەوێشەوە ئێمە ناڵێن مەعصومە دەڵێین هەڵە دەکات، بـەلاّم دەڵـێین دینەکەمان معصومە.

## خاڵێکی تر:

بەڕاستی ئێمە هەندێك جار تەناقوص لە قسەکانمان هەیـە، ئەگەر دین دین بیّ، بۆ ژین هـاتبیّ، خـوا ئینسـانی دروسـت کردوە، بونـەوەری بـۆ دروسـت کـردووە، تـەواوی ژیـانی بـۆ فەراهەم کردوە، بەلاّم خودا هـە قـی نیـە شـەریعەتی هـەبیّ، چونکە کە گوتت شەریعەت دەبیّ سیستەمیشی هەبیّ، ئێسـتا ترافیـــك لایتەکـــەی بکوژینـــەوە (١٠ ) خولـــەك، کارەبـــا بکوژینـــەوە ســـەد سەرپێچـی دەکـری، دوو شـــەو برادەرانـــی ئاسایش و پۆلیس لەو وولاتە نە مـینیّ، دەیـان دزی دەکـری، یەك وولاتم بۆ بینەو لەو دونیایە بیّ وەزارەتی دیفاع بـیّ، نیـە شتی وا ، کەواتە: یان ئیسلام نابێت شـەریعەتی تێـدابیّ یـان ئەگەر هەبیّ دەبیّ دەست برینیشـی تیـدا بێـت!، ئیسـتا لـە

وولاٙتی ئەوڕوپا بەشێك لە وانەی سزای دزەكان توندترە لــەوە، واتە توندترە لە دەست بڕین، ئەگەر سزا نەبێ وولــات دەبێتــە مافیا، ژیان نامێنێ، یە عنی كەكەسەكە دەسـتی دەبـڕێ بـۆ ئەوەی خەڵكێكی تر بـژی، كەكەسـەكە دەكـوژرێ بـۆ ئـەوەی خەڵكی تر بژی، ئەگەر نا ژیـان نـامێنێ، بۆیـە ئـەم یاسـایە پێوەرە لە ئیسلام داهاتووە.

## یەكێكی تر كەجەنابی دەفەرموێ یەكێك لە گرفتــە گەورەكان شەریعەتە!!!.

بۆ نموونە دەڵی ئیوە پێتان وایە بەس ئیسلام ڕاستە، ئەمە قســـەی خـــودای پـــەروەردگارە: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ﴾[1]. واتـــە: (بێگومـــان تـــەنها ئـــەم دیـــنی ئیسلامەیە, پەسەند و قبووڵە لای خوا).

[1] آل عمران: ١٩ .

کەواتە دوو لایەنە یان دەبێت قسەی خودای پەروەردگار ڕەت کەینەوە : ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ [1].واتە: (هەرکەسێ بێجگە لەبەرنامەو شەریعەتی ئیسلام هەردینێك بۆخۆی هەڵبژێرێ و بیکا بەبەرنامەی خۆی هەرگیز لێیوەرناگیردرێ و لەدوارۆژیشدا لەڕیزی زیانمەندانە).

خوا لێی قەبووڵ ناکات تەبعەن ئەوە بۆ قیامەت ، بەڵام لە دونیادا :﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ﴾ [2]. واتە: (ئەم هێڵە ڕاستەیە بەرنامەو ڕێبازەکەی منە ، دەسا ئێوەیش ئەی ئیمانداران ! هەمیشە شوێنی بکەون و هەر بەودا بچن. دەیەمی دەسپاردەکە خوا ئەفەرموێ: مەکەونە شوێنی ڕێچکەکانی تر، ئەوسا لە شاڕێگەکەی خوا بترازێن و پەڕاگەندە ببن).

[1] آل عمران: ٨٥.
[2] الأنعام: ١٥٣.

**ئەوە قورئانە دەفەرمووێ،** یان دەبێ ئەمە قبوڵ نەبێ، یان قبوڵمانە دەبێ تەئویلی بۆ بکەین، ئـی چـۆن تـە ئـویلی بـۆ دەکەین. لەبەر هەندی قەزیەی دین کـە ئێمـە باسـی دەکـەین قیامەت پەیوەندی بە ئێمەوە نیـە ئێمـە قـەڕار لەسـەر ئـەوە نادەین، کەسی کافر چی بەسەر دێت چی بەسەر نـایێ، لەبـەر ئەوە خوا قەڕاری لەسەر داوە حوکم لە قیامەت عایدی خـوای گەوریە، لە دونیا دا ئێمە قەناعەتمان وایە کە ئیسلام ئەسـاس و بناغە و نیزامە لە بۆ ژیان، هەر لە بارەی نزمترین بـە شـی ژیانەوە بیگرە، لە باری کەسی بگرە، وە لە بواری ژن هینان و مارەکردنە لە تەلاق و لە میراتە، یەك شتم بۆ بینە لـە ژیـان بە هەزاران قاعیدەی قورئانی و سونەتی لەسەر نەبێ، معقولە لەم قورئانە (٦٢٣٦) ئایەتە هاتوە بۆ ژیـان ئـەتۆ پێـی بلّیـی والله بەگەڵك ژیان نایە. ئاخر کـە (**مامۆستا هاوژین دەڵێ شەریعەتی ئیسلام گەورترین موشکیلەیە)** ئی ئەوە واتای ئەوەیە شەریعەت بۆتە هبەلاٚ بەسـەر ئومەتـەوە، لـەکاتێك دا ئەمە واقعی نیە ، لەبەر ئەوەی دوو کەس وەکو مـن غەلـەتی کـردوە، لەبـەر ئـەم هەلەیـەی مـن کردومـە نابێـت ئیسـلام شەریعەتی هە بێت، بەراستی ئەمە بێ ئینسافیە.

## یەکێکی تر لەو پرسیارانە ئایا کاتێك خەڵك دەڕوات بۆ ئەوڕوپا خەتای ئیسلامە؟ یان موسڵمانان؟

**وەلاَم:** جیهانی ئیسلامی هیچ سیستەمیکی ئیسلامی تێدا پەیڕەو ناکرێت هەموو سیستەمەکان عەلمانین، صدام حسین بۆ خۆی هاوار دەکات دەڵێت: (امة عربیة واحدة)، دواتر دەڵێ (وحدة حریة اشتراکیة ) ، خۆی دەڵی ئەمن نیزامم ئیشتراکیە، پەیوەندیم بە ئیسلامەوە نیە، ئەتۆ بۆ دێیی صەدام حسین لەسەر ئیسلام حیساب دەکەی.

حسونی موبارك " بشار اسد، زین العابدین، معمر قەرزافی، ئەوانە نیزامی عەلمانیەکانی ڕۆژهەلاَتی ناوەڕاستن، ئەوانە بەڕاستی ڕایان گەیاندوە کە عەلمانین، بڕۆن دەستورەکانیان بخوێنەوە، بۆ چەواشەمان دەکەن، بۆ بەهەڵە شتێك بەسەر ئێمەدا دەسەپێنن.

ئێستا لەولاَتی ئێمە هەرێمی کوردستان هەردوو حیزبی دەسەلاَت اعلانی عەلمانیەتیان کردووە، کە ئیعلانیان کردووە بۆ لەبەر منە خەلك لێرە هەڵدی دەچێتە ئەوروپا، بۆ لەسەر

ئیسلام حیسابی دەکـەن، ئیسـلام لـەکوێی ئـەم ژیانـە ئیشـم هەیە، لەکوێی ئەم ژیانە رێی پیدەدری تەنانەت هەناسەت بـۆ نـادری، چـۆن لەسـەر ئیسـلام حیسـابی دەکـەن، ئـەوە بـێ ئینسافیە.

ئینجـا ئـەوروپا بەڕاسـتی دەبـێ ئێمـە ئـەو واقیعـە زۆر بەڕاشـکاوی باسـی بکـەین، هـەموو کیشـەو مەشـاکیلی ئەوروپایان خستوتە سەر جیهانی ئیسلامی، هـەر لـەوولاتانی ئیسلامی هەر چی شەرو مەشـاکیلە لـەلای وانـەوە بـۆ ئێمـە هاتووە، بۆ خۆیان دوونیایەکی عەدالەتیان فەراهـەم کـردووە، بەلاّم هەرچی ئاگرو ئاسنە بە ئێمەوەی دەفرۆشن ئینجـا ئێمـە صاحیبەکانمان پێك هاتووە لەو کۆمەڵە ڕموزی کە ئێمە ئێستا باسم کرد بۆیە بەراستی ئەو نە هامە تیەی لەلای ئێمە هەیـە سەبەبەکەی ئیسلام نیە،

موسڵمان دەسەلاّتمان نەبووە ( ٢٧ ) سـاڵە لـەم وڵاتـەین دەسەلاّتمان بە دەستەوە نەبووە، ئەوەتا لەدوای ساڵی (١٩٢٤)

کاتێك کەمال ئەتاتورك ئیعلانی عەلمانیەتی کرد لە تووركیـا، جیهانی ئیسلامی هەموو کەوتە ژێـر دەسـتی عەلمانیـەکان، ئیسلام هیچ دەسەلاٚتیکی نەبووە، بۆچی ئەمە لەسەر ئیسـلام حیساب بیٚ، بەراستی ئەمە زولمە، ئەمە سـتەمە، ئەمـە بـیٚ ئینسافیە لەگەڵ ئێمەو لەگەڵ غەیری ئێمە٠



## خاڵی کۆتایی:

با بەجوانتر شی بکەمەوە ئەویش ئەوەییە دوو شت هەیە ئەویش دەبێ جوان شی کەینەوە ، ئیسلام ئەوەندەی ڕێزی لەخەڵکی غەیری موسلمان دەگرێ، چاودێری و حیمایەی لەسەر خۆی واجب کردوە، خزمەت کردنی واجبە کردوە، ئاوەدان کردنەوەی واجب کردوە. ئیسلام چووە ئیسپانیا، چوە ئەندەلووس غەرناتەی دروست کرد، ئیسپانیای دروست کرد، قورتوبەی دروست کرد، بڕۆ میژوو بخویننەوە هەموو زانکوکانی وولاتانی ئەورووپی بۆ (٢٠٠) سەدساڵیش مەنهەجەکانی لەلای فارابی و خواریزمی و ابن سینا و لای زانایانی ئیسلام دانرابون. بنەمای شۆڕشی فەرەنسی بەشێکی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە، کەواتە زانستمان پێشکەشی ئەوان کرد، سەقافەتمان پێشکەشی ئەوان کرد، شارستانیەتمان پێشکەشی ئەوان کرد، ژیانمان پێشکەشی ئەوان کرد، هەرچی خۆشی وئارامی و سعادەتە پێشکەشی ئەوان کرا!!!. بەلاّم بڕۆن تەماشای میژووکەن بەس لەغەرناتە کاتێك کە ئەوان هاتنە دەسەلاّت بەپێی داتاکان سێ ملیۆن کەسیان ئیبادە کرد، یەك

کەسـیان لەموسـڵمانان لـە ئەنـدەلوس نەهێشـت واتـە شـار بەدەریان کردن، ئێستا برۆ کەم ترین ڕێژەی وولاَت لەئیسـپانیا موسـڵمانن، لـەکاتیك دا کاتێـك ئیسـلام گەیشـتە وێ شارسـتانیەتی بـەرپاکرد، ژیـاری بـەرپاکرد، ئینسـانیەتی بەرپاکرد، بەزەی و رەحمی بەرپاکرد. بۆ مێژوو ناخوێنینـەوە، بۆچی ناچـین تەماشـای واقیعـی خۆیـان بکـەن لەکتیبـەکانی خۆیان ئەوە دەربێنن، ئینجا هاتن لە جیهانی ئیسلامی چـیان کـرد هەرچـی دەسـەلاَتی ئـەم ولاتانەییـە خسـتیانە دەسـتی کەسانی سیکۆلارەوە، ئاخر ئێمە نابێ ئەوە لەبیر بکـەین سـێ شێوازی سیکۆلار لە جیهانی ئیسـلامی دەوڵەتـداری کـردوە، کەمن نازانم کاك هـاوژینی کـە دەڵـی سـوڤیەت لەسـەر مـن حیساب نییـە، هیتلـەر لەسـەر مـن حیسـاب نیـە، شۆرشـی فەرەنسا لەسەر من حیسـاب نیـە ، ئێسـتای سـەرمایەداری ئەمەریکا لەسەر من حیساب نیە، مـن نـازانم کـام دەوڵـەتی سیکۆلار کاك هاوژین باسی دەکات پێم خۆشە کـاك کامـەران دەقیقەیـەك مـەجالی بـدات، یـەعنی بـابزانم کـام دەوڵـەتی سیکۆلار لەجیهانی ئیسلامی یان لەجیهانی ئـەوڕوپی بـەناوی سـیکولار حـوکم، ئیسـتا ئـەمریکا سەرپەرشـتی سیسـتمی

سەرمایەداری دەكات، وە لەو تەناقوزات زۆر لەژیانیان هەیـە، ئــەوان دەڵـێن سیســتەمی ســەرمایەداری لەكوردســتان هــەتا شۆرش كرا وتیان ئێمــە دژی ســەرمایەدارین، ئیســتا هەرچــی بەرپرسی ئێمەیە سەرمایەدارە ئەوە تیككگیرانە لەگــەڵ هــەموو فەلســەفەو سیســتەمە داخیلیــەكانیان، بەرپرســی حیزبــەكان گشتیان ســەرمایەدارن، هەرچــی مەزرەعــەو هەرچــی گــردوو دەسەلاٚتە لەدەســتەوانە، پارەییــە لەدەســتەوانە، لــەكاتیك دا ئەوان گوتیان سیســتەمی بۆرجــوازی هەلدەتەكینینــەوە، دژی سیستەمی سەرمایەدارین، ئێســتا هــەموویان ســەرمایەدارن، ئەگەر سیستەمیك لــە ڕۆژهــەلاٚتی ناوەراســت بەگشــتی یالــە ولاٚتــانی ئــەوڕوپی هەییــە پــێم بڵــی، سیســتەمێك هەییــە بانگراونــدی دیــنی لــەناو نیــە، لەســۆڤیەت لەسیاســەتی تەعلیمی تەمەشاكە یەكێك لەبنەماكانی سیاسەتی تــەعلیمی ئیلا دەبی بنەماكانی سۆڤیەت بخویندرێ كە شــوعیەتە لــەنێو مەداریسەكانی ابتدائی، وە من كتێبم لەســەر نوســیە، بــڕۆن تەماشــای ئــەلمانیای نــازی بكــەن، بزانــە بنــەمای سیاســەی تەعلیمی لە مەداریسی ئیبتدائی بنەمایــە نــازی تیكــەوتووە یان نا؟ بڕۆ تەماشایی ئەمریكا بكەن ماددە قانوونیــەكان لــە

دەستوری ئەو وولاَتە هەیە ماددەیەکی تێدایە کە ماددەیــەکی دینی یە، هیچ وولاتێك لە دونیا بی بنەمایی دینی نیە، ئــیلا بنەمایی دینی یان تیدا کردوە، راســتەو خــۆ لەئــەمریکا کــە بەئاشکرا ئالاَکەیان چی تیدایە (سەلیبی) تیدایە ئــێ ســەلیب نیشانەی دینە، خۆ کاك هاوژین بەمن دەڵــێ ئــەو ســیکولارە نــازانم کــی ســیکولارە! ئایــا ئــە و ســێ شــێوازە (شــێوازی سوڤیەت، شێوازە نازی وە شــێوازە ســەرمایەداری) هەرســی کیان یەك سەدە خوینیان ریشــت، یــەك ســەدە تونــدو تیــژیان کرد، یەك سەدە ئیرهابیان کرد، یەك سەدە هەرچی نەهامەتیە بەسەر میللەتانی ئەوروپایان هینا، ئەوجە ئاسەواری ئیستا لە ئە مریکاو وولاتانی ئەمریکاو بەشیك لە قارەکــانی ئــەمریکا عەبدایەتی سەری هەڵداوتەوە، رەش پێست لــەهوتێلی ســپی پێستەکان نــاتوانن دابــەزن، سیســتەمی ســیکولار لێناگــەڕێ بچیتەوی.

لە سیستەمی ئیمە بیلالی حەبەشی رەشپێشتی عەبــد لــە دەوڵەتداریەکــەی ئیســلام بــوە وەزیــری روشــنبیری، وەزیــری ئیعلامی لەدەست بوو.

پیغەمبەر (صلی اللە علیـه وسـلم) بـه سـەلمانی فارسـی دەفەرمووی (امـة) لە ئێمەیەو لە ئال و بەیتی منە، فارسـیش بوو. سوهەیب رومی بوو، ئەوە دەوڵەتداری ئیسلامە، ئـەوان دەوڵەتداریەك دەكەن بۆ پاكتاوی ڕەگەزی، كەی ئێمـە بیرمـان لەوەكردوتەوە قونبلەی زەڕی دروست بكەین كاتێك لە لوتكەی دەسەلاٌت دا بووین نەمان كردووە، كەی بیرمان لەوە كردۆتەوە ئێمە كیمیایی دروست كەین، ناكازاكی و هێرۆشیما و هەلبجە پی بكوژین، ئی خۆ هەلەبجە و شیخ وەسـانان كـێ كردویـەتی ئەوە دەسەلاٌتێكی عەلمانیە (وحدة حرية اشتراكية) كردوویەتی، بۆ لەسەر ئیسلام حیساب دەكـەی، بـڕۆن تەماشـایی نیزامـە كانیان كەن كەمن پـێم خۆشـە تەمـە نـام دەكـرد عەلمانیـەت ژیانی تێدا بایـە، تەنانـەت بـا بـێ بـەنیزامی دیموكراسـیەت لەگەڵـە ئێمـە هـەڵس و كـەوت بكـاتن قازانجمانـە، هـیچ موشكیلەمان نیە، بەس ئەو بە دیموكراسی لەگەڵ مـن بكـات دیموكراسی بایی ئەوندەیە كە بۆ خویـەتی، هەناسـەت نـاداتێ رێت پێ نادا.



## قسەی کۆتاییم :

لەسەر ئەوەبوو کە ماموستا هاوژین ئاماژە بەوە دەکات، دەبێ هەندێك بەڕاشکاوی بیین دەبێ بـزانین بـڕوا نـەبوون لەگەڵ پێکەوە ژیـان نـابێ تێکـەڵ بکـرێ، مانـای ئـەوە نیـە کەسێك بڕوای بە ئیسلام نـەبێ دەبـێ بکـوژرێ، شـتی وانیـە لەئیسلام : ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾ [1].

ئێمە پێمان ناخۆشـە کـە زوڵـمان لـی دەکـرێ کـە دەسـت بکەینەوە ناچارین دەست بکەینەوە

: ﴿ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ وَهُوَ كُرۡهٞ لَّكُمۡۖ ﴾ [2].

واتە: (لەسەرتان جەنگ نوسراوە- لەگەڵ بێ باوەڕاندا بیکەن- دیارە جەنگیش شتێکی قورس و نارەحەتەو خۆشتان لێینایـە، دڵ و دەروون حەزی پێ ناکا).

---

[1] البقرة: ٢٥٦.

[2] البقرة: ٢١٦ .

لەبەر ئەوەی سیستەمیەتی عالەمی لەگەل ئەوانە، زۆر ئاسانە بڵێی کاکە فلانەکەس بەرەوئیرهابی بردوو زۆر بەئاسانی سبەی مەحکەمەت بکەن قانونیکی ئیرهابی لەسەر جێبەجیٚ بکەن، بەلاٚم ئێمە لەوە شەرم ناکەین، وە نەمان کردوە، وە ئێمە لەوانە موجامەلەمان لەسەر دین نەکردوەو ، وەناشی کەین، بریارمان داوە ئەوەی کە قەناعەتمان پی یەتی وەکو مەبدە، قەناعەتمان واییە دینی ئیسلام سیستەمی ژیانە، تەبعەن هەموو دینەکانی تر هەموویان ڕێزیان لیٚ گیراون، هەموویان دینی خوایین، هەموویان دینی ئاسمانین، ئیسلام تەواوکەری دینەکانی ترە ئێمە وامان وتووە، قەت رۆژێك لەرۆژان بەعەکسەوە ئەمن دەڵیم ئیمان هێنان بەعیسا بەموسا سەلامی خودایان لی بیٚ، واجبە ئەو دەلێتە من بروام بە محمد نیە، ئەوجە من ئەوم قەبووڵە، ئەمن قەبوڵمە لەگەڵی دەژیم، بەس ئەو بڕوای بەدینی من نیە، ئەمن بڕوام بەدینی ئەو هەیە، ئەو فەرق و جیاوازییەی، یەعنی ئەوفراوانییەی لەلای موسڵمانان هەیە، لەلای ئەو نییە، لەلای موسڵمان ئیمان هینان بەدینەکانی ترو پیغەمبەرانیان رووکنە موسڵمان بڕوای بەئیبراهیم هەیە، بڕوای بە تەواوی دینەکانی تر هەبیٚ

رووكنە، لە دینەكەی ئێمە وایە بەڵاَم لەدینی ئەو دینــی مــن دین نیە، جگە لەوەش ئازادی تاك ئافرەتەك رەئی خۆی هەیــە حیجاب لەبەر دەكات، ئەوی تر سـفورە، قــەت قــەت ئیســلام نەهاتووە بەزۆر ئەو ســفورەی بكاتــە حیجــاب چــونكە ســفور قەناعـەتە ، وەئیمان قەناعـەتە.

بــەردەوام ئاشــتی لــە ئیســلامدا، ســەلام لــە ئیســلامدا مەبدەئە، واتە ئەساس سەلامە، مەبدەء سەلامە، واتا ئەصــل سەلامە ، ( ٦٣) چەنگ كراوە لەسەردەمی پێغەمبەر (صـلی الله علیه وسلم) هەر هەموویان بەرگری بوون، لە جەنگی بەدر دەست پێدەكا هەتا كۆتا جەنگ كــە جــەنگی ئــەحزاب بــوو، هــەموو دنیــای كودەنگیــان كــرد لەســەر دەوڵــەتی مەدینــە، هەموو جەنگەكان جەنگی بەرگری بــوون جــەنگی هێرشــكردن نەبوون، ئەمە گەورەترین بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی كــە ئێمــە راوەستاوین كە ئەوان لێمان دەدەن ناچارین بەرگری لە خۆمــان بكەین. كاتێك ئیسلام دەسەڵاتی كردە دەست بەنمونە: (٦٠٠) ســاڵ دەوەڵــەتی عوســمــانی دەوڵتــداری كــرد، دەوڵــەتێك بــوو دەسەلاتی گەیشتە دەرگای فەرەنسا، بۆ ناچن تەماشای مێژوو

بکـــەن، بۆنموونـــە ئـــەمڕۆ کـــە ســـەردەمی گەشەســـەندن و و تەکنەلۆجیا و مواصەلاتە بە چرکە، بە فاکس، بە تلێکس، بە جۆرەها شێواز زانیاری دەگات، کەچی لەو کـات هـیچ لەوانـە نەبوون، چەند لادێ هـەبوە لەسـەردەمی دەوڵـەتی ئیسـلامی لەپرسان مردبێ ، بێگومان نەبوە وە مێژوو توماری نـەکردوەو نەینوسیوە، بۆ؟ چونکە نەبوە. ئەدی ئێستا بە تەن گەنم و جـۆ و برنج فڕە دەدرێتە ناو بەحرەکان، وە ئێستاش لـە ولاتـەکانی ئەفریقیا خەڵك دەمرێ لە برسان، ئێ خۆ ئەوانیش مرۆڤن.

لەسەردەمی دەسەلاتی هارون الرشـید سـەر پشـتی چـیای حەمرین ئاوەڕۆی بۆ کردوە ، لە سەر پشتی ئاوی ڕاکێشاوە بۆ دێیەکانی دەورو بەری بۆ ئەوەی کەس نەمرێت لە تێنان و لـە برسان، یانی نازانم ئەو دەوڵەتە دیموکراسیەی کەئێسـتا هەیـە، بۆ خزمەتی خەڵك ناکەن!!!.

**خالّی کۆتایی:** کە کاك کامەران تەرکیزی لە سـەر دەکـات ئەمە وەکو موسڵمان لە سەردەمی ئاشتی زانایان دەفـەرموون لە فەترەی ئاشتی _ ٧٤٪ _ خـەڵك هاتنـە نـاو ئیسـلام ، یانی ئەگەر خەڵك هاتبێتە نێو ئیسـلام لەسـەردەمی حـەرب

(٢٦٪) بووه، ئەصلْ لەلای ئێمه ئاشتیه، بۆیه كاتێك صولحی حودەیبیه دەكرێت خودا دەفەرمویێت: ﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴾ [1]. ئەمه باسی صولحی حودەیبییەیه كەچی دەفـەرمویێت فەتح.

ومن دەتوانم لەگەڵ كـاك هـاوڕێن هەڵبكـەم وه ئیتهـامی نەكەم، زۆر سروشتیه ئەگەر ئـەو لەسـەر دیـنی مـن نـەبێت وەكاتێك قەناعەتی وایه دەڵێ شەریعەت گرفتـە، دەڵـێ لـەوه كارەساتر ئەوەیه كه خودا بـەو گەورەییـەی خـۆی دەسـەلاٌتی دانانی شەریعەتێكی نەبێت، كەچی سیكۆلاریزم بەشەر دایناوه دەسەلاٌتی هەبێت شەریعەت بو مروڤەكان دابنیٚ!!!.

مـن نمونەیـەك دێنمـەوه لەسـەر یـەكێك لـەو كابینانـەی پەڕلەمان ، مرۆڤ كه شەریعەت دادەڕێژێ بەردەوام لایـەنگیری دەكات، چونكه بەتەبیعەتی خۆی لەو ڕۆژانه پەڕلەمانی عێراق

[1] الفتح: ١.

بینیت بە پەنهانی قەراریان دا هەندێك ئیمتیازاتیان بۆ خۆیان گێڕاوە، دیارە پەڕلەمان جێی تەشریعە یەکێکە لە سوڵتە ئەساسەکانی دەوڵەتداری، سیکولاریزم چونکە بەشەر دای دەنێ بۆخۆیان تەرتیبەکیان کرد بۆئەوەی ئیمتیازاتێك بۆخۆیان دا بنێن، یەکێك لەو کابینانەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەسەردەمێك لەسەردەمەکان کۆمەڵێك ئەندام پەرلەمان بوون لەوانەی کە خاوەن زەوی و زاری زراعی بوون چونە ناو پەڕلەمان لەوێ قەراڕیان دانا هەرچی زەوی زراعیە بیکەنە موڵك، بۆ؟ چونکە لاگیری شەخسی هەیە مروڤ، بۆخۆی مۆرکی هەیە دەیەوێ قەراری بۆ دەرکا، بەس خودا کە شەرعی بۆ ئافرەتو پیاو و منداڵ و گەورە و شێخ و بەتەمەن و ریش سپی و نەخۆش و ڕەش و سپی و موسڵمان و بێباوەر و ئەهلی کتاب و هەمووی پێویستی بۆ لاگیری نییە، خودا پێویستی بەلادان نییە، خوا پێویستی بە هیچ کەس نیە: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾[1]. خوا دەوڵەمەندە، بەلام

[1] آل عمران: ٩٧.

هەموو ئەندامێکی پەڕلەمان کە بەشێکە لـە دانـانی تەشـریع ئـــیلا لایـــەنگیری هەیـــە یـــان بـــۆ حیزبەکـــەی، یـــان بـــۆ عەشیرەتەکەی، یان بۆ خـۆی، یـان بـۆ فکرەکـەی، ئـیلا لـە کۆتـــایی بـــە فیکـــری خـــۆی دەچەســـپێنی. لەکۆتاییـــدا زۆر سوپاستان دەکەم داوای لێبوردن دەکەم.

**پیشکەشکار:** زۆر سوپاس دەستەکانت خۆش.

ماموستا هـاوژین دەقـەی ئیزافیەکـەش دەدەینـە تـۆ بـۆ ئەوەی وەکو وتمان دادگەری بچەسپێت:

**ماموستا هاوژین:** سوپاس بۆ ماموسـتا سـوپاس بـۆ تـۆ لەبەر ئەوەی دەقیقەیەك زۆر کەمە بـۆ ئـەوەی قسـەی لەسـەر بکەم، ڕاستیەکەی سیکۆلاریزم سـێ بنـەمای سـەرەکی هەیـە یەکێکیان: دیموکراسیە، بۆ یەکێك لەو هەڵـە کوشـندانەی کـە دەکرێت جیا کردنەوەی سیکۆلاریزمە لـە دیموکراسـیەت، ئـەو کەسـەی باسـی تـەوافوق بـە دیموکراسـی بـەبێ سـیکولاریزم

سوعبه‌ت ده‌كات، دیموكراسی بـه‌بێ سـیكولاریزم بـه‌دێ نایـه سیكولاریزم واته دیموكراسی واته رادیكالیزم واته ئه‌قلانیـه‌ت، جیاكردنه‌وی ئه‌مانه لـه یـه‌كتر مشـكیله‌ی گـه‌وره‌ن ،تـۆ لای خۆت دیموكراسیه‌ت وه‌رنـاگرێ، چـۆن لـه ده‌وڵـه‌تی ئیسـلامی فه‌رزی حیجاب ناكرێت من با وه‌ك و نوكته‌ش بۆ بـه‌ڕێزتان وه عه‌كسه‌كه‌ی به ماموٚستا بڵـێم مامۆسـتا بـاش ئـه‌زانێت كـه حه‌زره‌تی عمر له ئافره‌تی داوه له‌سه‌ر خۆ داپۆشین نه‌ك له‌سـه‌ر خۆ ڕووت كردنه‌وه ، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی جاریه بوه كوتویه‌تی خوتـان ئه‌چوێنن به ژنه ئازاده‌كان، فه‌لاقه‌ی كـردوون له‌سـه‌ر ئـه‌وه‌ی خۆیان دانه پۆشیوه جا تو ته‌سه‌ر بكـه ئه‌گـه‌ر خۆیـان ڕووت كه‌نه‌وه ده‌بێ چی لێ ئه‌كه‌ن، ئینجا الغایه تبرر الوسیله لـه‌لای ئه‌وانیش ئه‌وه هه‌یه‌ی (الامور بمقاصیدها)، هتیـة. ئینجا انفال ئه‌زیزان فتوحاتی ئیسلامی، ئه‌م هه‌موو سابایه‌و ئه‌وانـه چـۆن ته‌فسیر ده‌كرێت.

**پێشكه‌شـكار:** ده‌سـت خـۆش بـه‌ڕێزان سـووپاس بـۆ ئامـه‌ده‌بوونی هـه‌مووتان زۆر خۆشـحاڵ بـووین كـه ئـه‌م دوو بـه‌ڕێزه هـه‌م تێگه‌یشـتنێكی گشـتگیریان داینـێ له‌سـه‌ر

توندڕەوی، وە هەمیش ئاڕاستەی دیبەیتەکە جۆرێك لە جۆرەکان ئاراستەیەکی فکریشی وەرگرت، دوا جار پێم وایە ئەمە دەبێتە خزمەت بۆ کۆمەڵگای ئێمە قەرار بوو کە گفتوگۆی بەشداربووان هەبێ بەلاّم لەبەر نەبوونی کات، وە زۆر داوای لێبووردن دەکەین کە گفتوگۆی بەشداربووان نابێ، وە ئەم دوو بەڕێزەش ئیلتزامی تریان هەیە، بۆیە زۆر داوای لێبووردن دەکەین، وە هەر کەسێك، کە سەرنج و تێبینی و پرسیارێکی هەبێت لە ڕێگەی سۆشیاڵ میدیای هەڵمەچوو دەتوانێ پەیوەندیمان پێوە بکات ئێمەش پرسیارەکانتان دەگەیەنین بەم دوو بەڕێزە، وە هەر لەوێوە وەلاّمتان دەدەینەوە دیارە ئێمە ئێستا چالاکی ترمان ماوە، بەس من لە کۆتایدا دەمەوێ زۆر سوپاسی ماموستا هاوژین بکەم ماموستای زانکۆ، وە زۆر سوپاسی د.ادریس بکەم بەڕێوەبەری گشتی دەزگای ڕوونـاکی، لە کۆتایدا دەمانەوێت ئەم دوو بەڕێزە خاوەنی کۆمەڵێك کتێبن کتێبەکانی خۆیان پێشکەسی یەکتری بکەن ،بۆ ڕەخسادنی کەشێکی ئاشتی چونکە هەموشمان لەگەڵ ئاشتین لەگەڵ هەڵ مەچووین، لەگەڵ نا توندوتیژین، لەگەڵ ئەوەی بۆیە گوڵی سپیشیان هێناوە پێشکەشی یەکتر دەکەن.

# ناوەڕۆک



**د.إدريس كاريتانى**



**م.هاوژین مەلا ئەمین**

ئاشتی و توندڕەوی دوو چەمک و زاراوەن جیهانی ئیسلامیان پڕکردووە لە ململانێ و گفتوگۆ و دیبەیت, ئەم دوو چەمکە لەنێوان دوو ئایدۆلۆژیای جیاوازی ئیسلام و عەلمانیەتدا ململانێیەکی قوڵی دروستکردووە.

ئایا کام لەم فکرەو ئایدیایانە خاوەنی ئاشتین یان سەرچاوەی توند ڕەوین، زۆر بەداخەوە ئایدیای ئیسلامی لەگەڵ ئەوەی خاوەنی یاساو ڕێساو واقیع و مێژوێکی سیاسی و فکری دوور و درێژە لە ئاشتی و پێکەوە ژیان و یەکتر قبوڵ کردن، کەچی تۆمەتبار دەکرێ بەتوندڕەوی، بەپێچەوانەوە عەلمانیەت یان سیکۆلار واقیعێکی سەد ساڵەی بەرچاوانی ئەم سەردەمەی هەیە لەجیهانی ئەوروپی و ئیسلامی لەتوندڕەوی، کەچی بۆتە خاوەنی ئاشتی و ئارامی بەشیعارو دروشمی بێ بنەمای بریقەدار، بەهۆی ئەوەی ئیسلام لە سیستەمی سیاسی و دەسەڵات و حوکم دا نەماوە، ئەوی ماویەتی تەنها نوسین و قەڵەمە!


**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

**نرخی 2000 دینار**